بەشێک لەکتابی

# الإبانة الكبرى

بەکوردی

ذِكْرِ الذُّنُوبِ الَّتِي تَصِيرُ بِصَاحِبِهَا إِلَىَ كُفْرٍ غَيْرِ خَارِجٍ عَنِ الْمِلَّةِ

باسکردنی ئەو تاوانانەی کەخاوەنەکەی توشی کوفرێک دەکات

لەدین نایباتە دەرەوە

نوسـینی:

أبي عبدالله عبيدالله بن محمد بن حمدان بن بطة العكبري

(٣٨٧هـ) رحمهالله

وەرگـێـڕانی: زانـا الـكردي

# بەشێك لە کتابی

# الْإِبَانَةُ الْكُبْرَى

## بە کوردی

## ( بَابُ ذِكْرِ الذُنُوبِ التِي تَصِيرُ بِصَاحِبِهَا إِلى كُفْرٍ غَيْرِ خَارِجٍ عَنِ المِلةِ )

**باس کردنی ئەو تاوانانەی کە خاوەنەکەی تووشی کوفرێك دەکات لە دین نایباتە دەرەوە.**

**نووسینی: أبي عبدالله عبيدالله بن محمد بن حمدان بن بطة العكبري (٣٨٧ هـ) رحمه الله**

**وەرگێڕانی: زانا الكردي**

# ( بَابُ ذِكْرِ الذنوبِ التِي تَصِيرُ بِصَاحِبِهَا إِلى كُفْرٍ غَيْرِ خَارِجٍ عَنِ المِلةِ )

## باس کردنی ئەو تاوانانەی کە خاوەنەکەی تووشی کوفرێك دەکات (بەڵام) لە دین نایباتە دەرەوە.

# پێشەکی

**بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ**

**الحمدلله وحده والصلاة والسلام على من لا نبي بعد، أما بعد:**

پێم باش بوو بۆ بەرچاو ڕوونی موسوڵمانان ئەم بابەتەی هەڵمان بژاردووە لە کتابی **(الإبانة الكبرى)** کە هی ئیمام ابن بطة ی حەنبەلیە بکەینەوە بە کوردی بە ناوی (**ذِكْرِ الذُّنُوبِ الَّتِي تَصِيرُ بِصَاحِبِهَا إِلَى كُفْرٍ غَيْرِ خَارِجٍ عَنِ الْمِلَّةِ**) واتە: باسکردنی ئەو تاوانانەی کە خاوەنەکەی توشی کوفرێك دەکات لە دین نایباتە دەرەوە.

جا ناساندنی ئەم بابەتە بە خەڵکی زۆر گرنگە بۆ ئەوەی توشی غلو و گومڕایی نەبن، وە تا ئەوەی لە دینەکەتان لێتان شاراوەتەوە یان لێتان گۆڕاوە بە پێچەوانەکەی ئەوا بۆتان ڕاست بکەینەوەو تێگەشتن و فەهمتان فراوان بکەین، وە بە ئیزنی الله تعالى ببێتە مایەی شارەزابوونی موسڵمانان و هیدایەت وەرگرتنیان لەم بابەتەداو تێگەیشتن لە عەقیدەی سەلەف و ئەهلی سوننە، هەروەها ئەم بابەتەی کە ئیمام ابن بطة دایناوە تەنها دانراوی ئەم نییە و پێش ئەم قسەی لەسەر نەکراێ بەڵکو پێش ئەمیش زانایان باسیان

کردووە و باب یان بۆ داناوە، هەر وەك ئیمام أبو عبيد القاسم بن سلام کە باسی کردووە وە ابن أبي زمنين يش بابی لەسەر داناوە هاوشێوەی ابن بطة، وە لەناو نەجدیەکانیش هەبووە کە هاوشێوەی ابن بطة باب ی داناوە دەربارەی کوفرو شیرکی بچووك، وە بزانە کە هەتا ئەم کاتەی ئێستا زانایەکی ئەهلی سوننە نەبووە کە بڵێ ابن بطة هەڵە بووە لەم بابەتەداو نەیپێکاوە، بەڵکو یەقینت هەبێ کە ئەمە عەقیدەی هەموو ئەهلی سوننەیەکە بە حەق و هیچ خیلافێك بوونی نییە لەوەی کە ئەم بابەتانەی ابن بطة هێناویەتی لەم بابەدا هەمووی مەبەست پێی کوفرو شیرکی بچووکە.

هەروەها بزانە رحمك الله کە بێگومان لە دینی ئیسلامدا کوفرو شیرکی گەورەو لە دین دەرخەر هەیە، وە کوفرو شیرکێکیش هەیە کە مرۆڤ پێی لەدین ناچێتە دەرەوە بەڵکو توشی تاوانی گەورە دەبێت پێی، لە چەندین ئایەت و فەرموودەو وتەی زانایان وشەی کوفرو شیرك بەکار هاتووە کە مەبەست پێی کوفرو شیرکی بچووکە و خاوەنەکەی پێی لەدین دەرناچێ.

باشە چۆن بزانین کە ئەم کوفرە یان ئەم شیرکە لەم ئایەت و فەرموودانەی کە هاتووە مەبەست پێی کوفرو شیرکی بچووکە ؟ بە کورتی پێت دەڵێم قاعیدەیەکی قورئانی بگرەبەرو لێی تێ بگە بە ئیزنی الله تووشی گرفت نابی.

الله تعالى دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفۡتَرَىٰٓ إِثۡمًا عَظِيمًا ۝٤٨﴾[١]

واتە: بەڕاستی الله خۆش نابێت گەر هاوبەشی بۆ دابنرێ، بێجگە لەوە خۆش دەبێت لەهەر گوناهێکی تر بۆ هەرکەسێك کە بیەوێت، وە هەر کەسێك هاوبەش بۆ الله دابنێت ئەوە بێگومان گوناهێکی زۆر گەورەی هەڵبەستووە.

کەواتە بزانە کە الله تعالى لەم ئایەتە پیرۆزەدا دەفەرمووێ تەنها لە شیرك خۆشنابم، لە هەموو تاوانەکان خۆشدەبێ گەر ویستی لێ بێت، کەواتە بزانە و شیرك بناسەوە، گەر لە جێیەك باسی هەر تاوانێك کرا بە کوفر یان شیرك ناوی هێنرا مادەم شەریك بۆ الله بڕیاردانی تێدا نەبێت ئەوە کوفرو شیریکی بچووکە، بۆیە بەهۆی ناو هێنانی تاوانێك بە کوفر ئیتر مەرج نییە کوفری لە دین دەرخەر بێت بەڵکو لە گەورەیی تاوانەکە بە کوفر ناوی هاتووە.

جا بۆ ئەوەی زیاتر شارەزابین لەم بابەتە پێویستە دیراسەی کتوبەکانی سەلەف بکەین بزانین چ شتێك لایان کوفری گەورە بووە و چ شتێك لایان کوفری بچووك بووە، جا لەم باب ەدا کە کردوومانەتەوە بە کوردی ئیمامی ابن بطة چەندین ئایەت و فەرموودەی هێناوە کە وشەی کوفر یان شیرکی تێدا بەکار هاتووە و هەروەها وتەی زانایانی سەلەفی

---

(١) النساء (٤٨).

هێناوە کە وشەی کوفریان بەکار هێناوە بۆ تاوانێك کە مەبەست لێی کوفری بچووکە و خاوەنەکەی پێی کافر نابێ، وە ئەمە هیچ جیاوازیەکی تێدا نییە لای ئەهلی سوننە کە ئەم بابەتانەی ابن بطة هێناویەتی هەمووی دەلالەت لە کوفرو شیرکی بچووك دەکات ئەگەرچی پێشی وترابێ کافر هەر مەبەست پێی کوفری بچووکە و خاوەنی ئەو کردارە لەدین ناچێتە دەرەوە.

الله تعالی بەرچاومان ڕووناك بکات و کوفرو شیرکمان بە گەورەو بچووکەوە پێ بناسێنێت و شارەزامان بکات لە دینەکەی و عەقیدەمان دامەزراو بکات لەسەر ڕێبازی سەلەف و دوور بین لە فکرەی خەواریج و مورجیئە و جەهمیەکان، وە لەسەر ڕێیەکی ناوەند بڕۆین و نە زیادەڕەویمان هەبێت وەك خەواریج و نە خۆشمان توشی ئیرجاء بکەین وەك مورجیئەکان، ئامین.

# « پوختەیەک لە ژیاننامەی ئیمامی ابن بطة »

**ناو:** عبیدالله بن محمد بن محمد بن حمدان بن عمر بن عیسى بن إبراهیم بن سعد بن عتبة بن فرقد ی هاوەڵی رسول الله (ﷺ).

**کونیەکەی:** باوکی عبدالله العکبري.

[کە دەگەڕێتەوە بۆ عکبرا، کە ناوچەیەکە لەسەر دیجلە دەکەوێتە سەرووی بەغداد بە پێنج سەد فەرسەخ].

**نازناو:** ابْنُ بَطَّة، کە دەگەڕێتەوە بۆ یەکێك لە باپیرانی.

**لە دایك بوونی:** (٣٠٤)ی هجري – کۆچی.

**وەفاتی:** (٣٨٧)ی هجري – کۆچی.

**ژیانی:** إِبْنُ بَطَّة لە ماڵێکی زانست و سوننەتدا گەورە بووە، باوکی لە ئەهلی عیلم و فەرموودە بوو، بۆیە گرنگی پێی داوە و وای لێکردووە گوێ بۆ فەرموودە بگرێ کە هێشتا منداڵە، وە ڕێی پێداوە بە گەشت کردن بۆ بەغداد بۆ داواکردنی زانست کە تەمەنی لەو کاتەدا دە ساڵ تێپەڕی نەکردووە.

**علي بن أحمد بن البسري دەڵێ:** أبو عبدالله ابن بطة فەرمووی: باوکم لە بەغداد چەند هاوبەشێکی هەبوو، وە لەناویاندا پیاوێك هەبوو بە أبو بكر

دەناسرا، جا بە باوكمی وت: كوڕەكەت بنێرە بۆ بەغداد تاكو گوێی لە فەرموودە بێت، وتی: كوڕەكەی من منداڵە، بۆیە وتی: من لەگەڵ خۆم دەیبەم. جا بردمی بۆ بەغداد، منیش چووم بۆ لای ابن منيع كە لەو كاتەدا فەرموودەی بەسەر دەخوێنرایەوە، هەندێكیان پێیان وتم: داوا لە شێخ بكە موعجەمەكەیت پێ بدا، منیش داوام لە كوڕەكەی كرد، یان لە كچەزاكەی، وتی: ئەو داوای درهەم دەكات [واتە لە بەرامبەر موعجەمەكەیدا]، ئێمەش پێماندا، پاشان (كتاب المعجم) مان بەسەریدا خوێندەوە بە تاكەكەسی لە ماوەی دە ڕۆژدا، یان كەمتر یان زیاتر، وە ئەمەش لە ساڵی پانزەیەمیندا بوو، یاخود شانزەیەمین.

پاشان گەشتەكەی درێژەی كێشا بۆ داواكردنی زانست لە كاتێكدا كە گەورە بووبوو، جا زۆر گەشتی كرد بۆ مەككە، و الثغور، و بەصرە، وە جگە لەم ناوچانەش. پاشان گەڕایەوە ناوچەكەی خۆی، وە خۆی لە خەڵكی داڕنی.

**القاضي أبو حامد أحمد بن محمد الديلوي دەڵێ:** كاتێك أبو عبدالله ابن بطة گەڕایەوە لە گەشتەكەی، لە ماڵەكەی مایەوە بۆ ماوەی چل ساڵ، وە یەك ڕۆژیش لەو ماوەیە لە بازاڕ نەبینرا، وە نەبینرا إفطار بكاتەوە جگە لە جەژنی قوربان و ڕەمەزان [و اللّٰه اعلم واتە دایمەن بە ڕۆژوو بووە]، وە فەرمانی دەكرد بە چاكە، وە هەواڵی خراپەیەكی پێ نەدەگەیشت ئیللا دەیگۆڕی.

**وتى: وە گوێم لە نصر بن الفرج البزار بوو دەيوت:** چوومە ژوورەوە بۆ لاى أبو عبدالله ابن بطة و ئەو بەڕۆژوو بوو لە ڕۆژێكى زۆر گەرمدا، جا بينيم سينگى لەسەر چينێكى شۆردراو دانابوو خۆى بەوە فێنك دەكردەوە.

**أبو محمد الجوهري دەڵێ:** گوێم لە براكەم بوو أبا عبدالله فەرمووى: پێغەمبەرم (ﷺ) بينى لە خەودا پێموت: يا رسول الله (ﷺ) كامە مەزهەب (ڕێباز) چاكە؟ يان وتى: پێم وت بچمە سەر كامە مەزهەب؟

فەرمووى: {ابن بطة ابن بطة ابن بطة}.[1]

(١) طبقات الحنابلة.

# « مامۆستاكانى »

گوێى لە فەرمودە بووە لە:

١- أبو بكر أحمد القطيعي.

٢- أبو الفضل جعفر القافلاني.

٣- أبو بكر احمد بن سلمان النجاد.

٤- أبو بكر بن زياد النيسابوري.

٥- أبو القاسم البغوي.

وە هەندێكى تر.

# « قوتابییەكانی »

١- ابن شهاب العكبري.

٢- أبو اسحاق البرمكي.

٣- أبو عبدالله بن حامد البغدادي.

٤- أبو بكر الزاهد.

وە هەندێكی تر.

# « هەندێ وەسف و پیاهەڵدان لەسەری »

**السمعاني دەڵێ:** لە فەقیهی حەنبەلیەكان بوو، نووسراوانێكی بەسوودی نووسیوە.

**ابن كثير دەڵێ:** یەكێكە لە زانایانی حەنبەلیەكان .

**العتيقي دەڵێ:** شێخێكی چاكەكار بوو، دوعای وەڵام دەدرایەوە.

**الذهبي دەڵێ:** ابن بطة ئیمام و پێشەنگ، عابد، فەقیهـ، فەرموودەناس، وە شێخی عێراق بوو.

# « قاعیدەک لەبەرچاو بگرە لەم بابەتەدا »

هەر ئەثەرێك لەم باب ەدا کە بە کوردی و عەرەبی دەیخەینە بەردەستتان لە هەر کامێکیان وشەی کوفر یان شیرك بەکار هاتبوو، بە نموونە بڵێ: موشریکە یان کافرە یان ئەو شتە کوفرە یان شیرکە، ئەمانە هەمووی لە هەر ئەثەرێك بینیت بەبێ هیچ گومانێك مەبەستی کوفرو شیرکی بچووکە و ئەو کەسەی ئەنجامی دەدات پێی کافر نابێ بەڵکو توشی تاوانێك لە تاوانە گەورەکان بووە، واللّٰه اعلم.

**تێبینی:** لەم بابەتەدا تەنها مەتنی ئەثەرەکانمان کردووە بە کوردی ئیسنادەکانیمان نەنوسیوەتەوە دیسان، بە عەرەبی هەموویمان داناوە بە کامل ئیسنادەوە بۆیە تەنها مەتنەکەیمان کردووە بە کوردی.

# دەستپێك:

أَخْبَرَنَا الشَّيْخُ الْإِمَامُ أَبُو الْحُسَيْنِ عَلِيُّ بْنُ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ نَصْرٍ الزَّاغُونِيُّ، قَالَ: أَخْبَرَنَا الشَّيْخُ أَبُو الْقَاسِمِ عَلِيُّ بْنُ أَحْمَدَ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَلِيٍّ بْنِ الْبُسْرِيِّ، قَالَ: أَخْبَرَنَا أَبُو عَبْدِ اللَّهِ عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ حَمْدَانَ بْنِ بَطَّةِ إِجَازَةً، قَالَ:

بَابُ: (ذِكْرِ الذُّنُوبِ الَّتِي تَصِيرُ بِصَاحِبِهَا إِلَى كُفْرٍ غَيْرِ خَارِجٍ عَنِ الْمِلَّةِ).

١- **(١٠٤٨)** حَدَّثَنَا أَبُو الْفَضْلِ جَعْفَرُ بْنُ مُحَمَّدٍ الْقَافْلَائِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ مُحَمَّدُ بْنُ إِسْحَاقَ الصَّاغَانِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا خَلَفُ بْنُ الْوَلِيدِ , قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو جَعْفَرٍ الرَّازِيُّ , عَنْ لَيْثٍ , عَنْ مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ , عَنْ أَبِي بَكْرٍ , قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «الشِّرْكُ أَخْفَى فِيكُمْ مِنْ دَبِيبِ النَّمْلِ , أَوْ دَبِيبِ الذَّرِّ». قَالَ أَبُو بَكْرٍ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيَكُونُ شِرْكًا لَا يَجْعَلُ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا يُعْبَدُ مِنْ دُونِهِ؟ قَالَ: " ثَكِلَتْكَ أُمُّكَ يَا أَبَا بَكْرٍ , وَقَالَ: يَا صِدِّيقُ , الشِّرْكُ أَخْفَى مِنْ دَبِيبِ النَّمْلِ أَوْ دَبِيبِ الذَّرِّ " , وَلَكِنِّي سَأَدُلُّكَ عَلَى مَا يُذْهِبُ صِغَارَ الشِّرْكِ , وَكُبَّارَهُ ,

أَوْ قَالَ: صَغِيرَ الشِّرْكِ وَكَبِيرَهُ , تَقُولُ عِنْدَ الصُّبْحِ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ أَنْ أُشْرِكَ بِكَ وَأَنَا أَعْلَمُ , وَأَسْتَغْفِرُكَ لِمَا لَا أَعْلَمُ "[١]

واتە: أَبِي بَكْر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) دەڵێ: پێغەمبەرى الله (ﷺ) فەرموويەتى: « شيرك لەناو ئێوەدا شاراوەترە لە شوێن پێى مێروولە، يان لە شوێن پێى مێروولە بچووكەكان ». أَبُو بَكْر وتى: ئەى پێغەمبەرى الله (ﷺ) چۆن شيرك ڕوودەدات لەكاتێكدا لەگەڵ الله دا خوايەكى تر نەپەرستراوە لە غەيرى ئەو ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووى: دايكت ڕۆڕۆت بۆ بكات ئەى أَبَا بَكْر، وە فەرمووى: ئەى صِدِّيقُ (ڕاستگۆ)، شيرك شاراوەترە لە شوێن پێى مێروولە، يان لە شوێن پێى مێروولە بچووكەكان، بەڵام ڕێنموونيت دەكەم بۆ شتێك كە شيركە بچووكەكان و گەورەكان لادەبات، يان فەرمووى: شيركى بچووك و گەورە، بەيانيان بڵێ: **(اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ أَنْ أُشْرِكَ بِكَ وَأَنَا أَعْلَمُ , وَأَسْتَغْفِرُكَ لِمَا لَا أَعْلَمُ)** (پەروەردگارا پەنات پێ دەگرم كە شيرك بۆ تۆ ئەنجام بدەم وە دەزانم كە شيركە ، وە داواى لێخۆشبوونت لێ دەكەم لەوەى كە نايزانم).

٢- **(١٠٤٩)** حَدَّثَنَا جَعْفَرٌ , قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْحَاقَ , قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ عَمْرٍو , قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو إِسْحَاقَ , عَنْ لَيْثٍ , عَنْ رَجُلٍ , عَنْ مَعْقِلٍ,

(١) ئەم فەرموودەيە ئيمامى بوخارى لە الأدب المفرد بە ژمارە (٦١٥) هێناويەتى.

قَالَ: سَمِعْنَا أَبَا بَكْرٍ , يَقُولُ: أَوْ سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَنَا مَعَهُ: «الشِّرْكُ فِيكُمْ أَخْفَى مِنْ دَبِيبِ النَّمْلِ» , فَذَكَرَ نَحْوَهُ.

واته: مَعْقِل دەڵێ: بیستم أَبَا بَكْر (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) دەیوت: یان بیستم لە پێغەمبەری الله (ﷺ) وە من لەگەڵی بووم دەیفەرموو: « شیرك لە ناو ئێوەدا شاراوەترە لە شوێن پێی مێروولە ». فەرموودەکەی باسکرد بەهەمان شێوەی پێشوو.

٣- (١٠٥٠) حَدَّثَنَا جَعْفَرٌ , قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْحَاقَ , قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ أَبَانَ , قَالَ: حَدَّثَنَا السَّرِيُّ بْنُ إِسْمَاعِيلَ الْهَمْدَانِيُّ , قَالَ: حَدَّثَنَا قَيْسُ بْنُ أَبِي حَازِمٍ , قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا بَكْرٍ , يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: «كُفْرٌ بِاللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ ادِّعَاءُ نَسَبٍ لَا يُعْرَفُ , وَكُفْرٌ بِاللَّهِ تَعَالَى تَبَرُّؤٌ مِنْ نَسَبٍ وَإِنْ دَقَّ»[1]

واته: قَيْسُ بْنُ أَبِي حَازِم، دەڵێ: بیستم أَبَا بَكْر (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) دەیوت: بیستم پێغەمبەری الله (ﷺ) دەیفەرموو: کوفر کردنە بە الله عَزَّوَجَلَّ بانگەشە کردن بۆ لای ڕەچەڵەکێك کە نەناسراوە و خۆت لەوان بزانی، وە کوفر

(١) ئەم فەرموودەیە الطبراني لە الأوسط بە ژمارە (٢٨١٨ - ٨٥٧٥) هێناویەتی.

کردنە بە الله تعالى بەرائەت کردن لە ڕەچەڵەکی خۆت ئەگەرچی ڕەچەڵەکەکەی بچوکیش بێت [واتە ئەگەر چی ڕەچەڵەکت ڕەچەڵەکێکی خاوەن پایە نەبێت، بەڵکو لە ڕەچەڵەکێکی خراپیش بیت نابێت بەرائەتی لێ بکەیت].

٤- (١٠٥١) حَدَّثَنَا أَبُو الْحُسَيْنِ إِسْحَاقُ بْنُ أَحْمَدَ الْكَاذِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَلٍ , قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي , وَحَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَكْرٍ , قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ , قَالَ: حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ , قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يَزِيدَ , قَالَ: حَدَّثَنَا حَيْوَةُ بْنُ شُرَيْحٍ , قَالَ: حَدَّثَنِي جَعْفَرُ بْنُ رَبِيعَةَ , أَنَّ عِرَاكَ بْنَ مَالِكٍ , أَخْبَرَهُ أَنَّهُ , سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ , يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: «لَا تَرْغَبُوا عَنْ آبَائِكُمْ , فَإِنَّهُ مَنْ رَغِبَ عَنْ أَبِيهِ , فَإِنَّهُ كُفْرٌ بِهِ»[١]

واتە: أبي هُرَيْرَة (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) دەڵێ: بیستم پێغەمبەری الله (ﷺ) دەیفەرموو: پشت هەڵمەکەن لە باوکتان، چونکە هەرکەسێ پشت لە باوکی بکات ئەوە کوفری پێ کردووە.

(١) ئەم فەرموودەیە ئیمام أحمد لە مسند بە ژمارە (١٠٨١٣)، والبخاري (٦٧٦٨)، ومسلم (١٣٠)، لە صحیحەکەیان هێناویانە.

بَابُ: (ذِكْرِ الذُّنُوبِ الَّتِي تَصِيرُ بِصَاحِبِهَا إِلَى كُفْرٍ غَيْرِ خَارِجٍ عَنِ الْمِلَّةِ) / باسكردنی ئەو تاوانانەی كە خاوەنەكەی توشی كوفرێك دەكات لە دین نایباتە دەرەوە.

٥- **(١٠٥٢)** حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ مُحَمَّدُ بْنُ بَكْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ , قَالَ: حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ , قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ , عَنْ سُلَيْمَانَ , عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُرَّةَ , عَنْ أَبِي مَعْمَرٍ الْأَوْدِيِّ , عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ , رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: «كُفْرٌ بِاللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ تَبَرُّؤٌ مِنْ نَسَبٍ وَإِنْ دَقَّ , كُفْرٌ بِاللَّهِ ادِّعَاءٌ إِلَى نَسَبٍ لَا يُعْرَفُ»

واتە: أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيق (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) دەفەرمووێ: كوفر كردنە بە اللّٰه عَزَّوَجَلَّ بەرائەت كردن لە ڕەچەڵەكی خۆت ئەگەرچی ڕەچەڵەكەكەی بچوكیش بێت [واتە ئەگەرچی ڕەچەڵەكت ڕەچەڵەكێكی خاوەن پایە نەبێت، بەڵكو لە ڕەچەڵەكێكی خراپیش بیت نابێت بەرائەتی لێ بكەیت]، وە كوفر كردنە بە اللّٰه بانگەشە كردن بۆ لای ڕەچەڵەكێك كە نەناسراوە [واتە خۆت بدەیتە پاڵ ڕەچەڵەكێك كە هی خۆت نییە].

٦- **(١٠٥٣)** حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ مُحَمَّدُ بْنُ بَكْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ , قَالَ: حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ , قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادٌ , عَنِ الشَّهِيدِ , عَنْ مَيْمُونِ بْنِ مِهْرَانَ, عَنْ عَدِيِّ بْنِ أَبِي عَدِيٍّ , أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: " يَا زَيْدُ بْنَ ثَابِتٍ أَمَا عَلِمْتَ أَنَّهُ كَانَ نَزَلَ: لَا تَرْغَبُوا عَنْ آبَائِكُمْ فَإِنَّهُ كُفْرٌ بِكُمْ "

واتە: عُمَرَ بْنَ الْخَطَّاب (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) دەفەرمووێ: ئەی زەیدی كوڕی ثابت ئایا دەزانی كە دابەزیوە: پشت هەڵمەكەن لە باوكتان چونكە ئەوە كوفرە بۆتان.

[ڕوونكردنەوە بۆ ئەثەری (١٠٥٠) - (١٠٥١) - (١٠٥٢) - (١٠٥٣): مەبەست لەوەی كە دەڵێ پشت هەڵمەكەن لە باوكتان و خۆتان مەدەنە پاڵ غەیری باوكتان چونكە كوفرە ئەم كوفرە كوفری بچووكە بێ هیچ گومانێك، وە ماناكەشی واتە: بەرائەت نەكات لە ڕەچەڵەكی خۆی لەوەی لەم باوكەیە و خۆی بداتە پاڵ كەسێكی تر لە كاتێكدا دەزانێ فڵان كەس باوكیەتی، وە عەرەب لە جاهیلیەتدا ڕێگریان لەوە نەكردووە كەسێك منداڵێك بكاتە كوڕی خۆی كە لە ڕاستیدا هی خۆی نەبووە و لە ڕەچەڵەكی ئەو نەبووە، وە ئەمە تا سەرەتای ئیسلام هەبوو تاكو الله تعالی ئایەتی دابەزاند و فەرمووی: ﴿ٱدۡعُوهُمۡ لِأٓبَآئِهِمۡ هُوَ أَقۡسَطُ عِندَ ٱللَّهِۚ﴾[1] ، واتە: بەناو باوكی خۆیانەوە بانگیان بكەن ئەوە دادپەروەرترە لای الله تعالی.

جا لەسەر ئەم بابەتە سەحابەیەكی بەڕێز هەیە كە بە ناوی غەیری باوكی بانگ كراوە تا ئەم ئایەتە دابەزی ئەویش (زَيْدَ بْنَ حَارِثَةَ)یە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

(١) الأحزاب (٥).

بَابُ: (ذِكْرِ الذُّنُوبِ الَّتِي تَصِيرُ بِصَاحِبِهَا إِلَى كُفْرٍ غَيْرِ خَارِجٍ عَنِ الْمِلَّةِ) / باسكردنی ئەو تاوانانەی کە خاوەنەکەی توشی کوفرێك دەکات لە دین نایباتە دەرەوە.

عَبْدِاللَّهِ بْنِ عُمَر (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) دەفەرمووێ: زَيْدَ بْنَ حَارِثَة مەولای پێغەمبەری الله (ﷺ) بوو، ئێمە بانگمان نەدەکرد ئیللا بە زەیدی کوڕی محمد نەبێ، هەتا قورئان دابەزی: ﴿ٱدۡعُوهُمۡ لِأٓبَآئِهِمۡ هُوَ أَقۡسَطُ عِندَ ٱللَّهِۚ﴾[1] ، واتە: بەناو باوکی خۆیانەوە بانگیان بکەن ئەوە دادپەروەرترە لای الله تعالى.

حَدَّثَنَا مُعَلَّى بْنُ أَسَدٍ ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ الْمُخْتَارِ ، حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ، قَالَ : حَدَّثَنِي سَالِمٌ ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ زَيْدَ بْنَ حَارِثَةَ مَوْلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا كُنَّا نَدْعُوهُ إِلَّا زَيْدَ ابْنَ مُحَمَّدٍ، حَتَّى نَزَلَ الْقُرْآنُ : ﴿ٱدۡعُوهُمۡ لِأٓبَآئِهِمۡ هُوَ أَقۡسَطُ عِندَ ٱللَّهِۚ﴾].[2]

**٧- (١٠٥٤)** حَدَّثَنَا أَبُو مُحَمَّدٍ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ جَعْفَرٍ الْكَفِّيُّ , قَالَ: حَدَّثَنَا الْحَسَنُ بْنُ عَرَفَةَ, قَالَ: حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَبُو جَعْفَرٍ الْأَبَّارُ , قَالَ: حَدَّثَنَا

---

(١) الأحزاب (٥).
(٢) صحيح البخاري (٤٧٨٢).

مَنْصُورٌ , وَالْأَعْمَشُ , عَنْ أَبِي وَائِلٍ , عَنْ عَبْدِ اللَّهِ , عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: «سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ , وَقِتَالُهُ كُفْرٌ»[١]

واتە: لە عَبْدِاللَّه وە (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ)، لە پێغەمبەری اللّٰه وە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: جنێودان بە موسڵمان فسقە، وە شەڕ کردن لەگەڵی کوفرە.

٨- (١٠٥٥) حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ مُحَمَّدُ بْنُ بَكْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ , قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو كَامِلٍ, قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ , عَنْ مُغِيرَةَ , عَنْ إِبْرَاهِيمَ , عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ , قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ , وَقِتَالُهُ كُفْرٌ»

واتە: ابْنِ مَسْعُود (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) دەڵێ: پێغەمبەری اللّٰه (ﷺ) فەرموویەتی: جنێودان بە موسڵمان فسقە، وە شەڕ کردن لەگەڵی کوفرە.

(١) ئەم فەرموودەیە ئیمام أحمد لە مسند بە ژمارە (٣٦٤٧ - ٣٩٠٣) ، والبخاري (٤٨)، ومسلم (١٣٣) لە صحیحەکەیان هێناویانە.

**٩- (١٠٥٦)** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَكْرٍ , قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ , قَالَ: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى الرَّازِيُّ , قَالَ: حَدَّثَنَا عِيسَى بْنُ زَكَرِيَّا , عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ , عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سَعْدِ بْنِ مَالِكٍ, عَنْ أَبِيهِ , عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ , وَقِتَالُهُ كُفْرٌ»

واتە: لە مُحَمَّدِ بْنِ سَعْدِ بْنِ مَالِك، لە باوکیەوە، لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە، فەرموویەتی: جنێودان بە موسڵمان فسقە، وە شەڕ کردن لەگەڵی کوفرە.

**١٠- (١٠٥٧)** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَكْرٍ , قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ , قَالَ: حَدَّثَنَا الْمُنْذِرُ بْنُ الْوَلِيدِ الْجَارُودِيُّ , قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: حَدَّثَنِي حُمَيْدٌ يَعْنِي ابْنَ مِهْرَانَ , عَنْ صَالِحٍ الْعُرَابِيِّ , قَالَ: شَهِدْتُ الْحَسَنَ، وَعَمْرُو بْنُ كَيْسَانَ سَأَلَهُ عَنْ هَذَا الْحَدِيثِ , فَقَالَ: يَا أَبَا سَعِيدٍ: «قِتَالُ الْمُؤْمِنِ كُفْرٌ , وَسِبَابُهُ فُسُوقٌ». وَهُوَ يَرُدُّ عَلَى عَمْرٍو , وَقَالَ: حَدَّثَنِيهِ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُغَفَّلٍ , عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: صَالِحٍ الْعُرَابِيِّ دەڵێ: حەسەنی بەصریم بینی، وە عَمْرُو بْنُ كَيْسَان پرسیاری لێ کرد دەربارەی ئەم فەرموودەیە، پێی وت: ئەی باوکی سەعید: شەڕ کردن لەگەڵ ئیماندار کوفرە، وە جنێودان پێی فسقە. وە ئەو وەڵامی

پرسیارەکەی عَمرو دەداتەوە، وە وتی: عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُغَفَّل بۆی گێڕامەوە، لە پێغەمبەری الله (ﷺ).

١١- **(١٠٥٨)** حَدَّثَنَا أَبُو شَيْبَةَ عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ جَعْفَرٍ , قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ الْوَاسِطِيُّ , وَحَدَّثَنَا أَبُو عَلِيٍّ إِسْمَاعِيلُ بْنُ مُحَمَّدٍ الصَّفَّارُ قَالَ: حَدَّثَنَا الْحَسَنُ بْنُ عَلِيِّ بْنِ عَفَّانَ , قَالَا: حَدَّثَنَا ابْنُ نُمَيْرٍ , عَنِ الصَّلْتِ , عَنْ عَامِرٍ , عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ , قَالَ: سِبَابُ الْمُؤْمِنِ فُسُوقٌ , وَأَخْذٌ بِرَأْسِهِ كُفْرٌ.

واتە: ابْنِ مَسْعُود (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) دەفەرمووێ: جنێودان بە ئیماندار فسقە، وە شەڕ کردن لەگەڵی کوفرە.

١٢- **(١٠٥٩)** حَدَّثَنَا أَبُو الْعَبَّاسِ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْعَسْكَرِيُّ , قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ الْمُنَادِي , قَالَ: حَدَّثَنَا رَوْحُ بْنُ عُبَادَةَ , وَحَدَّثَنَا إِسْحَاقُ الْكَاذِيُّ, قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَحْمَدَ , قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي قَالَ: حَدَّثَنَا رَوْحٌ , قَالَ: حَدَّثَنَا عَوْفٌ, عَنْ خِلَاسٍ , عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ , قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «مَنْ أَتَى عَرَّافًا أَوْ كَاهِنًا , فَصَدَّقَهُ بِمَا يَقُولُ , فَقَدْ كَفَرَ بِمَا أُنْزِلَ عَلَى مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ»(١)

(١) ئەم فەرموودەیە ئیمام أحمد لە مسند بە ژمارە (٩٥٣٦) هێناویەتی.

واته: أَبِي هُرَيْرَة (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) دەڵێ: پێغەمبەری الله (ﷺ) فەرموویەتی: هەر کەسێك بچێتە لای عەڕافێك یان کاهینێك جا بڕوا بەوە بکات کە دەیڵێت، ئەوا کافر بووە بەوەی کە بەسەر محمد (ﷺ) دابەزیوە.

١٣- (١٠٦٠) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ أَحْمَدَ , قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَحْمَدَ , قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ , عَنْ عَوْفٍ , قَالَ: حَدَّثَنَا خِلَاسٌ , عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ , وَالْحَسَنِ , عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «مَنْ أَتَى كَاهِنًا أَوْ عَرَّافًا , فَقَدْ كَفَرَ بِمَا أُنْزِلَ عَلَى مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ»

واته: لە أَبِي هُرَيْرَة و الْحَسَن، لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: هەر کەسێك بچێتە لای کاهینێك یان عەڕافێك، ئەوا کافر بووە بەوەی کە بەسەر محمد (ﷺ) دابەزیوە.

١٤- (١٠٦١) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ الْكَاذِيُّ , قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَحْمَدَ , قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ , قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ , عَنْ حَكِيمٍ الْأَثْرَمِ, عَنْ أَبِي تَمِيمَةَ الْهُجَيْمِيِّ , عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ , قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ

وَسَلَّمَ: «مَنْ أَتَى كَاهِنًا فَصَدَّقَهُ بِمَا يَقُولُ فَقَدْ كَفَرَ بِمَا أُنْزِلَ عَلَى مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ»[1]

واتە: أَبِي هُرَيْرَة (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) دەڵێ: پێغەمبەری اللّٰه (ﷺ) فەرموویەتی: هەر کەسێك بچێتە لای کاهینێك جا بڕوا بەوە بکات کە دەیڵێت ئەوا کافر بووە بەوەی کە بەسەر محمد (ﷺ) دابەزیوە.

**١٥- (١٠٦٢)** حَدَّثَنَا أَبُو جَعْفَرٍ مُحَمَّدُ بْنُ عَمْرِو بْنِ الْبَخْتَرِيِّ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَنْصُورٍ الْحَارِثِيُّ , قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ , عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ , قَالَ: حَدَّثَنِي نَافِعٌ, عَنْ صَفِيَّةَ , عَنْ بَعْضِ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «مَنْ أَتَى عَرَّافًا فَصَدَّقَهُ بِمَا يَقُولُ لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلَاةٌ أَرْبَعِينَ يَوْمًا»[2]

واتە: نَافِع دەگێڕێتەوە لە صَفِيَّة ئەویش لە هەندێك لە هاوسەرانی پێغەمبەر(ﷺ) دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: هەرکەسێك

(١) ئەم فەرموودەیە ئیمام أحمد لە مسند بە ژمارە (٩٢٩٠-١٠١٦٧)، وأبو داود (٣٩٠٤)، والترمذي (١٣٥)، وابن ماجە (٦٣٩) لە سنن هێناویانە.
(٢) ئەم فەرموودەیە ئیمام أحمد لە مسند بە ژمارە (٢٣٢٢٢-١٦٦٣٨)، ومسلم (٢٢٣٠) لە صحیحەکەی هێناویانە.

بچێتە لای عەڕافێك جا بڕوا بەوە بکات کە دەیڵێت ئەوە نوێژی لێ وەرناگیرێ ماوەی چل ڕۆژ.

[ڕوونکردنەوەی ئەم فەرموودانە و چوونە لای کاهین و عەڕاف و ساحیرەکان: کاهین و عەڕاف و فاڵچی و بەختگرەوەو ساحیر ئەمانە نووشتە و سیحر بۆ خەڵکی دەکەن تا شتێکیان بۆ ببێت یان کەسێك توشی کێشە بکەن کە لەمڕۆدا زۆر بڵاوە جا بە پێویستم زانی هەندێ ڕوونکردنەوە بۆ ئەم فەرموودەیە دانێم تا حوکمی چوونە لای ئەمانە ڕوونتر بێتەوە:

ئیمامی ابن بطة ئەم فەرموودەیەی لە بابی کوفری بچووك هێناوە، کەواتە کە دەڵێ (فَقَدْ كَفَرَ بِمَا أُنْزِلَ عَلَى مُحَمَّدٍ) مەبەست پێی کوفری بچوکە، واتە پێی کافر نابێت تەنها بەوەی بڵێ ڕاست دەکات بەڵکو ئەم فەرموودەیە لای سەلەف بە کوفری بچووك دانراوە هەروەك:

**ابن مفلح الحنبلي دەڵێ:** وە هەر کەسێك خاوەنی شەرع کوفرەکەی ڕەها و موتڵەق کردبێت لە خۆدانە پاڵی بۆ لای غەیری باوکی، وە هەر کەسێك بچێتە لای عەڕافێك جا باوەری پێ بکات بەوەی دەیڵێت، ئەوە وتراوە کوفری کردووە بە نیعمەت، وە وتراوە نزیکە لە کوفر، هەروەها **ابن حامد باسی دوو ڕیوایەتی کردووە لە ئیمام أحمد ەوە:**

**یەکێکیان:** لە بابی توندی و تەئکید کردنە. حنبل بن اسحاق نەقڵی کردووە کە ئیمام أحمد وتویەتی (کفر دون کفر)ە، دەری ناکات لە ئیسلام.

**دووەمیان:** واجبە وەستان تێیدا، ناوترێت کوفرێکی دەرخەرە لە دین یاخود دەرخەر نییە، ئەمەش وتەی ئیمام أحمدە لە ڕیوایەتی صالح و ابن الحکم.

**قال ابن مفلح "مَسْأَلَةٌ " قَوْلُهُ:** وَمَنْ أطلق الشارع كفره كدعوا غَيْرَ أَبِيهِ, وَمَنْ أَتَى عَرَّافًا فَصَدَّقَهُ بِمَا يَقُولُ فَقِيلَ: كَفَرَ النِّعْمَةَ, وَقِيلَ: قَارَبَ الْكُفْرَ, **وَذَكَرَ ابْنُ حَامِدٍ رِوَايَتَيْنِ:**

**"إحْدَاهُمَا"** تَشْدِيدٌ وَتَأْكِيدٌ. نَقَلَ حَنْبَلٌ كُفْرٌ دُونَ كُفْرٍ, لَا يُخْرِجُ عَنْ الْإِسْلَامِ.

**"وَالثَّانِيَةُ"** يَجِبُ التَّوَقُّفُ وَلَا يُقْطَعُ بِأَنَّهُ لَا يُنْقَلُ عَنْ الْمِلَّةِ, نَصَّ عَلَيْهِ فِي رَوِيَّةِ صَالِحٍ وَابْنِ الْحَكَمِ, انْتَهَى.[١]

**تقي الدين بن النجار الحنبلي دەڵێ:** وە هەر کەسێك خاوەنی شەرع بە کوفری دانابێت وەك خۆدانە پاڵی بۆ لای غەیری باوکی، وە هەر

(١) الفروع لابن مفلح الحنبلي (١٠/٢١٢).

كەسێك بچێتە لای عەرافێك و باوەڕی پێ بكات بەوەی دەیڵێت، ئەوانە لەسەر توندییە و خاوەنەكەی بەوە دەرناچێت لە ئیسلام.

**قال ابن النجار:** وَمَنْ أَطْلَقَ الشَّارِعُ كُفْرَهُ كَدَعْوَاهُ لِغَيْرِ أَبِيهِ وَمَنْ أَتَى عَرَّافًا فَصَدَّقَهُ بِمَا يَقُولُ فَهُوَ تَشْدِيدٌ لَا يَخْرُجُ بِهِ عَنْ الْإِسْلَامِ.[١]

**موسىٰ بن أحمد الحجاوي الحنبلي دەڵێ:** هەر چ شتێك شەرع دانەر بە كوفری دانابێت ئەوە كوفرێكە لە دین دەری ناكات، هاوشێوەی ئەو كەسەی خۆی بداتە پاڵ جگە لە باوكی، یان كەسێك بچێتە لای عەرافێك و باوەڕی پێ بكات بەوەی دەیڵێت، ئەوە لەسەر توندییە و خاوەنەكەی لە ئیسلام دەرناچێت.

**قال الحجاوي:** ومن أطلق الشارع كفر - فهو كفر لا يخرج به عن الإسلام: كدعواهم لغير أبيهم وكمن أتى عرافا فصدقه بما يقول فهو تشديد وكفر لا يخرج به عن الإسلام وإن أتى بقول يخرجه عن الإسلام.[٢]

---

(١) منتهي الإرادات (٥/١٧٠).
(٢) الإقناع في فقه الإمام أحمد بن حنبل (٤/٢٩٧).

**حمود بن عبدالله التويجري النجدي لە كتابی (غربة الإسلام) بەشێكی داناوە باسی كوفری بچووك دەكات و دەڵێ:** وە لە كوفرە بچوكەكان: باوەڕ كردن بە ساحیر و كاهین و عەڕاف، وە چوونە لای ئافرەت لە سوڕی مانگانەدا، وە چوونە لای ئافرەت لە دواوە، وە ئیمامی أحمد و خاوەنی سونەنەكان و البخاري لە « التأريخ الكبير » ڕیوایەتیان كردووە لە أبو هريره وە (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: هەر كەسێك بچێتە لای كاهینێك باوەڕ بكات بەوەی دەیڵێت، یان بچێتە لای ئافرەتێك لە سوڕی مانگانەدا، یان بچێتە لای ئافرەتێك لە دواوە، ئەوا بەری بووە بەوەی دابەزیوە بەسەر محمد (ﷺ).

**قال حمود بن عبدالله التويجري النجدي:** ومن الكفر الأصغر أيضا: تصديق السحرة والكهان والعرَّافين، وإتيان المرأة الحائض، وإتيان المرأة في دبرها؛ لما رواه الإمام أحمد، وأهل السنن، والبخاري في (التاريخ الكبير)، عن أبي هريرة - رضي الله عنه - أن رسول الله - صلى الله عليه وسلم - قال: «من أتى كاهنًا فصدقه بما يقول، أو أتى امرأة حائضًا، أو أتى امرأة في دبرها فقد برئ مما أنزل الله على محمد - صلى الله عليه وسلم -»[١]

(١) غربة الإسلام، لاپەڕە (٥٩٣).

پوختەی وتە لەسەر ئەم بابەتە ئەوەیە پرسیار كردن لە كاهن و ساحیر نابێتە كوفری گەورە مەگەر كەسەكە باوەڕی وابێت كە غەیب دەزانن، یان پێغەمبەر (ﷺ) بەدرۆ بخاتەوە لەوەی هەواڵی داوە، یان باوەڕی وابێت سوود و زیانیان بەدەستە جگە لە الله تعالى، یان ئیمان بە شیرك و كوفرەكانیان بێنێت، یان داوای كوفر و شیركێكی سەریحی لێ بكەن و ئەنجامی بدات، یان گوێڕایەڵیان بكات لە كوفر و شیرك، یان پێی جائیز بێت بچێتە لایان و پرسیاریان لێ بكات، ئەو كاتیش كافر دەبێ چونكە چوونە لایان حەڕامە، جا هەر كەسێك پێی حەڵاڵ بێت بچێتە لای كاهینێك یان ساحیرێك و پرسیاریان لێ بكات ئەوە كافرە و لە ئیسلام دەرچووە، وە هاوشێوەی ئەمانە، ئەگەر نا چوونە لای كاهن و ساحیر بۆ پرسیار لێ كردن زانایان لە كوفری بچووك دایان ناوە، بە مەرج دەبێتە كوفری گەورە و پێی كافر دەبێ، هەر وەك لەم ڕۆژەدا بۆ نموونە كە دەڵێن كەش و هەوا وتویەتی سبەی باران دەبارێ خەڵكیش دەڵێن بارانە جا بەمە كافر نابن مەگەر بڕوایان وابێ كە ئەم كەش و هەوایە بەشێكە لە غەیب و ئەوانەی كە ڕایدەگەیەنن غەیب دەزانن، ئەو كاتە پێی كافر دەبن چونكە تەنها الله غەیب دەزانێ كەسی تر غەیب نازانێ.

كەواتە ئەگەر بچیتە لای ساحیرێك پرسیاری لێ بكەیت چل ڕۆژ نوێژت لێ قەبوڵ نابێت و دەبێ نوێژیش بكەیت، ناكرێ واز لە نوێژ بهێنیت، گەر واز لە نوێژ بهێنیت كافر دەبیت، بۆیە كە دەڵێ نوێژی لێ وەرناگیرێ مانای وایە خێری دەست ناكەوێت و تەنها فەرزەكەی لەسەر لادەچێ، وە ئەگەر

پێشی وابێ کە غەیب دەزانێ یان گوێڕایەڵی بکات لە شیرك و کوفر یان پێی حەڵاڵ بێت بچێتە لایان بۆ پرسیار کردن ئەوە پێی کافر دەبێت بەپێی فەرموودەکەی کە دامان ناوە، وە ساحیرەکان هەموویان طاغوت و کافرن و حوکمیشیان کوشتنە گەر حوکمی ئیسلامی هەبێ وە داوای تەوبەشیان لێ ناکرێ و تەوبەشیان لێ وەرناگیرێ ئیللا دەبێ بکوژرێن لەسەر ڕای زۆرینەی زانایان.

جا لێرەدا پرسیارێک دێتە پێشەوە، ئەویش: ئایا ئەم فەرموودانە صحیحن؟

لە وەڵامدا دەڵێین: گەر فەرموودەکان صحیح بن یان نا ئەوە واتاکەیمان ڕوونکردووەتەوە و لای زانایان مانایان کردووە و حوکمیان لێ دەرهێناوە، واتە گرنگی خۆی هەیە، بەڵام با صحەتی فەرموودەکان بزانین ئایا صحیحە یان زەعیف؟

فەرموودەی ژمارە (١٠٥٩) - (١٠٦٠) ئیمام أحمد نەقڵی کردووە لە مسند و لە کتابی الإیمان، هەردووکی لە ڕێگەی (خِلاس ، عن أبي هريرة).

**أبو داود السجستاني دەڵێ:** بیستم أحمد بن حنبل دەیفەرموو: خِلاس هیچ شتێکی لە أبي هريرة نەبیستووە.

**قال أبو داود:** سمعت أحمد بن حنبل يقول: لم يسمع من أبي هريرة شيئا.[١]

كەواتە ئەم دوو فەرموودەیەی ئاماژەمان پێیدا هەردووكی (مرسل)ە واتە پچڕان لە سەنەدەكەی هەیە كە (خِلاس) گوێی لە (أبو هريرة) نەبووە، بەمەش فەرموودەكە دەبێتە زەعیف، والله اعلم.

هەرچی فەرموودەی ژمارە (١٠٦١)، هەر یەك لە ئیمام أحمد لە مسند و أبو داود و الترمذي و ابن ماجه لە سنن هێناویانە.

هەموویان لە رێگەی (أَبِي تَمِيمَةَ الْهُجَيْمِيِّ ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ) هێناویانە.

**ئیمامی بوخاری دەڵێ:** ئەم فەرموودەیە رەبتی پێ ناكرێت و شوێنی ناكەوین، وە نەزانراوە كە (أَبِي تَمِيمَةَ) گوێی لە (أَبِي هُرَيْرَةَ) بووبێ.

**قال البخاري:** هذا حديث لا بتابع عليه ، ولا يعرف لأبي تميمة سماع من أبي هريرة رَضِيَ اللهُ عَنْه.[٢]

(١) ميزان الاعتدال، بەرگی (١) لاپەڕە (٦٥٨).
(٢) التاريخ الكبير (٣/١٧).

کەواتە ئەم فەرموودەیەش (مرسل)ە، واتە پچڕان لە سەنەدەکەی هەیە، وەك ئیمام بوخاری ئاماژەی پێدا کە (أبي تميمة) گوێی لە (أبي هريرة) نەبووە، بەمەش فەرموودەکە دەبێتە زەعیف.

**ئیمامی الترمذي فەرموودەکەی بە زەعیف داناوەو دوای هێنانی فەرموودەکە لە سونەنەکەیدا دەڵێ:** ئەم فەرموودەیە ناناسین تەنها لە فەرموودەی: (حَكِيمٍ الْأَثْرَمِ، عَنْ أَبِي تَمِيمَةَ الْهُجَيْمِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ) نەبێ (واتە زەعیفە)، بەڵام واتای ئەمە لای ئەهلی عیلم و زانایان: لەسەر توندی و هەڕەشەیە (نەك کوفر)، وەك چۆن ڕیوایەت کراوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرموویەتی: « هەر کەسێك چووە لای ئافرەتی حەیزدار و بێ نوێژ با دینارێك بکات بەخێر » ، ئەگەر چوونە لای ئافرەتی حەیزدارو بێ نوێژ کوفر بوایە فەرمانی نەدەکرد کەفارەتەکەی بدات، وە محمد (واتە البخاري) ئەم فەرموودەی بە زەعیف داناوە لە ڕووی سەنەدەکەیەوە.

**قال الترمذي:** لَا نَعْرِفُ هَذَا الْحَدِيثَ إِلَّا مِنْ حَدِيثِ حَكِيمٍ الْأَثْرَمِ، عَنْ أَبِي تَمِيمَةَ الْهُجَيْمِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَإِنَّمَا مَعْنَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ الْعِلْمِ عَلَى التَّغْلِيظِ، وَقَدْ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ : " مَنْ أَتَى حَائِضًا، فَلْيَتَصَدَّقْ

بِدِينَارٍ ". فَلَوْ كَانَ إِتْيَانُ الْحَائِضِ كُفْرًا لَمْ يُؤْمَرْ فِيهِ بِالْكَفَّارَةِ، وَضَعَّفَ مُحَمَّدٌ هَذَا الْحَدِيثَ مِنْ قِبَلِ إِسْنَادِهِ.[١]

کەواتە فەرموودەکان زەعیفن، بەڵام ئەگەرچی زەعیفیش بێت کاری پێ دەکرێ، وە کار کردن پێی لە شێوازی هەڕەشەیە نەك مەبەست پێی کوفرو کافر بوون بێت هەروەك چۆن ئیمامی ابن بطة ئەم فەرموودانەی لەژێر بابی کوفری بچووك هێناوە و کۆی کردوونەتەوە، والله اعلم.

جا ئەو فەرموودەیەی لەم بابەتەدا صحیحە فەرموودەی ژمارە (١٠٦٢)ە کە ئیمام أحمد لە مسند و ئیمام مسلم لە صحیحەکەی هێناویانە، کە هەر کەسێك بڕواتە لای عەرافێك و باوەڕی پێ بکات، چل ڕۆژ نوێژی لێ وەرناگیرێ، ئەمە تاکە فەرموودەیە کە بە صحیحی هاتبێ، جا ئەگەرچی فەرموودەکان زوعفی هەیە بەڵام زانایان حوکمیان لێ دەرهێناوە و کاریان پێ کردووە، واتە زوعفی فەرموودەکان نابێتە هۆی ئەوەی کە حوکمەکان بگۆڕێ یان کاری پێ نەکرێت، وە هەر بەو شێوەیە کە ڕوونمان کردەوە فەرموودەکان باس لە کوفری بچووك دەکەن، والله اعلم].

(١) سنن الترمذي (١٣٥).

**١٦- (١٠٦٣)** حَدَّثَنَا أَبُو عَلِيٍّ إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ الْحُلْوَانِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ يُوسُفَ بْنِ دِينَارٍ الْبَغْدَادِيُّ , قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ الْفِرْيَابِيُّ , قَالَ: حَدَّثَنَا الْأَوْزَاعِيُّ , قَالَ: حَدَّثَنِي إِسْمَاعِيلُ بْنُ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي الْمُهَاجِرِ الْمَخْزُومِيُّ , قَالَ: حَدَّثَتْنِي كَرِيمَةُ بِنْتُ الْحَسْحَاسِ الْمُزَنِيَّةُ , قَالَتْ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ , فِي بَيْتِ أُمِّ الدَّرْدَاءِ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: "ثَلَاثٌ هُنَّ مِنَ الْكُفْرِ بِاللَّهِ: النِّيَاحَةُ , وَشَقُّ الْجَيْبِ , وَالطَّعْنُ فِي النَّسَبِ"[١]

واته: كَرِيمَةُ بِنْتُ الْحَسْحَاسِ الْمُزَنِيَّة دەڵێ: بيستم أَبَا هُرَيْرَة (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) لە ماڵی أُمِّ الدَّرْدَاء (رَضِيَ اللهُ عَنْها) دەيوت: پێغەمبەری الله (ﷺ) فەرموويەتی: سێ شت هەن لە كوفر كردنە بە (الله): شين و ڕۆڕۆ كردن لەسەر مردوو، وە دادڕينی سنگ [كە لە كاتی پرسەكاندا هەيە]، وە تانەدان لە ڕەچەڵەك.

**١٧- (١٠٦٤)** حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ مُحَمَّدُ بْنُ بَكْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ , قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ , قَالَ: أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ , عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ , عَنِ ابْنِ عُمَرَ ,

(١) ئەم فەرموودەيە ابن حبان لە صحيحەكەی بە ژمارە (٣١٦١) هێناويەتی.

قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: " مَنْ قَالَ لِأَخِيهِ: كَافِرٌ , فَقَدْ بَاءَ بِهِ أَحَدُهُمَا "[(١)]

واته: ابْنِ عُمَر (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُما) دەڵێ: پێغەمبەرى الله (ﷺ) فەرموويەتى: هەر كەسێك بە براكەى بڵێ: كافر، ئەوە ئەو كافر بوونە بۆ يەكێكيان دەگەڕێتەوە.

**١٨- (١٠٦٥)** حَدَّثَنَا أَبُو جَعْفَرٍ مُحَمَّدُ بْنُ عُبَيْدِ اللَّهِ الْكَاتِبُ قَالَ: حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ بُدَيْلٍ, وَحَدَّثَنَا الصَّفَّارُ , قَالَ: حَدَّثَنَا الْحَسَنُ بْنُ عَلِيِّ بْنِ عَفَّانَ , وَحَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَكْرٍ , قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ , قَالَ: حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ , وَحَدَّثَنَا إِسْحَاقُ الْكَاذِيُّ , قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَحْمَدَ , قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، قَالُوا كُلُّهُمْ: حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ , وَقَالَ ابْنُ حَنْبَلٍ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ أُسَامَةَ , قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ , عَنْ نَافِعٍ , عَنِ ابْنِ عُمَرَ , قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «مَنْ كَفَّرَ أَخَاهُ , فَقَدْ بَاءَ بِهَا أَحَدُهُمَا»[(٢)]

---

(١) ئەم فەرموودەيە ئيمام أحمد لە مسند بە ژمارە (٥٢٥٩)، والبخاري (٦١٠٤)، ومسلم (٦٠) لە صحيحەكەيان هێناويانە.
(٢) ئەم فەرموودەيە ئيمام أحمد لە مسند بە ژمارە (٦٢٨٠) هێناويەتى.

واتە: ابْنِ عُمَر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) دەڵێ: پێغەمبەری الله (ﷺ) فەرموویەتی: هەر کەسێك کوفر بداتە پاڵ براکەی، ئەوە کوفرەکە بۆ یەکێکیان دەگەڕێتەوە.

**١٩- (١٠٦٦)** حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ مُحَمَّدُ بْنُ بَكْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ , قَالَ: حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ , وَمُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ , قَالَا: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ , عَنْ عَمْرٍو , عَنْ أَبِي وَائِلٍ , عَنْ عَبْدِ اللَّهِ , قَالَ: " إِذَا قَالَ الرَّجُلُ لِلرَّجُلِ: أَنْتَ عَدُوِّي , فَقَدْ كَفَرَ أَحَدُهُمَا بِالْإِسْلَامِ "

واتە: عَبْدِاللَّهِ بن مسعود (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) دەفەرمووێ: ئەگەر پیاوێك بە پیاوێکی وت: تۆ دوژمنی منی، ئەوە یەکێکیان کافر دەبن بە ئیسلام.

**٢٠- (١٠٦٧)** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَكْرٍ , قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ , قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَوْنٍ, قَالَ: أَخْبَرَنَا خَالِدُ بْنُ مُطَرِّفٍ , عَنْ أَبِي السَّفَرِ , عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ سُوَيْدِ بْنِ مُقَرِّنٍ , قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: "أَيُّمَا رَجُلٍ قَالَ لِرَجُلٍ: كَافِرٌ , فَقَدْ بَاءَ بِهِ أَحَدُهُمَا"

واتە: مُعَاوِيَةَ بْنِ سُوَيْدِ بْنِ مُقَرِّن، دەڵێ: پێغەمبەری الله (ﷺ) فەرموویەتی: ئەگەر پیاوێك وتی بە پیاوێك: کافر، ئەوە کافر بوونەکە بۆ یەکێکیان دەگەڕێتەوە.

**٢١- (١٠٦٨)** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَكْرٍ , قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ , قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ أَبَانَ بْنِ صَالِحٍ , قَالَ: حَدَّثَنَا حُسَيْنٌ , عَنْ زَائِدَةَ , عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي زِيَادٍ , عَنْ عَمْرِو بْنِ سَلَمَةَ , عَنْ عَبْدِ اللَّهِ , قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «مَا مِنْ مُسْلِمَيْنِ إِلَّا وَبَيْنَهُمَا سِتْرٌ مِنَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ, فَإِذَا قَالَ أَحَدُهُمَا لِصَاحِبِهِ كَلِمَةَ هَجْرٍ خَرَقَ سِتْرَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ»(١)

واتە: عَبْدِاللَّهِ بن مسعود (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) دەڵێ: پێغەمبەری الله (ﷺ) فەرموویەتی: هیچ دوو موسڵمانێك نییە ئیللا لە نێوانیاندا ستر و داپۆشەری الله عزوجل هەیە بۆیان، جا ئەگەر یەکێکیان وتی بە هاوڕێکەی وشەیەك کە عەیبی هەڵبماڵێ ئەوە سترو داپۆشەری الله عزوجل ی دڕاندووە و نەیهێشتووە.

(١) ئەم فەرموودەیە البزار بە ژمارە (١٨٦٩) هێناویەتی.

[ڕوونكردنەوە: ئەمە ئەو فەرموودانەیە كە تێیدا هاتووە ئەگەر بە برا موسڵمانەكەت بڵێی كافر ئەوە كافر بوونەكە بۆ یەكێكتان دەگەڕێتەوە:

جا ئیمامی ابن بطة ئەم فەرموودانەی لەژێر ئەم باب ەدا هێناوە (بَابُ ذِكْرِ الذُّنُوبِ الَّتِي تَصِيرُ بِصَاحِبِهَا إِلَى كُفْرٍ غَيْرِ خَارِجٍ عَنِ الْمِلَّةِ) واتە: باسكردنی ئەو تاوانانەی كە خاوەنەكەی توشی كوفرێك دەكات لە دین نایباتە دەرەوە.

جا بۆمان دەركەوت كە بە تەكفیر كردنی برا موسڵمانەكەت گەر شتێكت لێ ببینی وات زانی كوفرە، یان وەك جنێو پێدان پێت وت كافر ئەوا ئەم كافر بوونە بۆ خۆت ناگەڕێتەوە و كەستان پێی كافر نابن هەروەك ابن بطة فەرموودەكانی لەژێر باب ی كوفری بچوكدا هێناوە، واتە پێی كافر نابنەوە كەسیان، ئەمما فەرموودەكان لەسەر شێوازی هەڕەشە هاتووە تا موسڵمان خۆی بپارێزێ لە تەكفیر كردنی برا موسڵمانەكەی، وە بە تەكفیر كردنەكەی پێی كافر نابێتەوە و لە چوارچێوەی تاوانی گەورەدایە.

هەندێك بەڵگەو نموونەی تر لەسەر ئەم بابەتە بۆ بەرچاو ڕوونی زیاتر:

**الله تعالى دەفەرمووێ:** ﴿وَلَا تَنَابَزُوا۟ بِٱلۡأَلۡقَٰبِۖ﴾[1]

واتە: ناوو ناتۆرە لە یەكتری مەنێن.

**عِكْرِمَة لەبارەی وتەی الله** ﴿وَلَا تَنَابَزُوا۟ بِٱلۡأَلۡقَٰبِۖ﴾ **دەڵێ:** ناوو ناتۆرە ئەوەیە پیاوێك بە پیاوێك بڵێ: ئەی موونافق، ئەی كافر.

ذِكْرُ مَنْ قَالَ ذَلِكَ: حَدَّثَنَا هَنَّادُ بْنُ السَّرِيِّ قَالَ: ثَنَا أَبُو الْأَحْوَصِ، عَنْ حُصَيْنٍ قَالَ: سَأَلْتُ عِكْرِمَةَ، عَنْ قَوْلِ اللَّهِ، ﴿وَلَا تَنَابَزُوا۟ بِٱلۡأَلۡقَٰبِۖ﴾ قَالَ: " هُوَ قَوْلُ الرَّجُلِ لِلرَّجُلِ: يَا مُنَافِقُ، يَا كَافِرُ "[2]

**مُجَاهِد لەبارەی وتەی** ﴿وَلَا تَنَابَزُوا۟ بِٱلۡأَلۡقَٰبِۖ﴾ **دەڵێ:** ناو ناتۆرە ئەوەیە پیاوێك بە كوفر بانگ كرابێت وە ئەو موسڵمان بێت.

(١) الحجرات (١١).

(٢) تفسير الطبري (٢١/٦٩).

حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ عَمْرٍو قَالَ: ثَنَا أَبُو عَاصِمٍ قَالَ: ثَنَا عِيسَى، وَحَدَّثَنِي الْحَارِثُ قَالَ: ثَنَا الْحَسَنُ قَالَ: ثَنَا وَرْقَاءُ، جَمِيعًا، عَنِ ابْنِ أَبِي نَجِيحٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، قَوْلَهُ: ﴿وَلَا تَنَابَزُوا۟ بِٱلْأَلْقَـٰبِ﴾ قَالَ: «دُعِيَ رَجُلٌ بِالْكُفْرِ وَهُوَ مُسْلِمٌ»[١]

**قَتَادَة لەبارەی وتەی ﴿وَلَا تَنَابَزُوا۟ بِٱلْأَلْقَـٰبِ﴾ دەڵێ:** فەرمووی بە پیاوێك: بە برا موسڵمانەکەت مەڵێ: ئەوە فاسقە، ئەوە مونافقە، اللّٰه نەهی کردووە لە موسڵمان لەم کارە، وە پێشتر باسی لێوە کردووە.

حَدَّثَنَا بِشْرٌ قَالَ: ثَنَا يَزِيدُ قَالَ: ثَنَا سَعِيدٌ، عَنْ قَتَادَةَ، قَوْلَهُ: ﴿وَلَا تَنَابَزُوا۟ بِٱلْأَلْقَـٰبِ﴾ "يَقُولُ لِلرَّجُلِ: لَا تَقُلْ لِأَخِيكَ الْمُسْلِمِ: ذَاكَ فَاسِقٌ، ذَاكَ مُنَافِقٌ، نَهَى اللَّهُ الْمُسْلِمَ عَنْ ذَلِكَ وَقَدَّمَ فِيهِ"[٢]

جا وەك بینیتان اللّٰه تعالى نەهی لێ کردووە کە موسڵمان بە برا موسڵمانەکەی بڵێ کافر یان فاسق یان مونافق چونکە ئەم کارە

---

(١) تفسير الطبري (٢١/٣٧٠).
(٢) تفسير الطبري (٢١/٣٧٠).

تاوانە، وە بۆمان دەركەوت كە پێی كافر نابیتەوە گەر بە براكەت وت كافر، وە گەر هیچت لێ نەبینی و هەروا پێت وت كافر ئەوە دەچێتە بابی ناو و ناتۆرەو جنێوەوە كە اللە تعالى نەهی لێ كردووە و دروست نییە وا بە براكەت بڵێیت.

**هەروەها زوهری و قەتادە (ڕەحمەتی اللە یان لێ بێت) دەڵێن:** ئەگەر كەسێك بە كەسێكی وت: ئەی دز، ئەی مونافیق، ئەی كافر، ئەی مەشروب خۆر، دەڵێن: لە هەموو ئەمانەدا تەعزیرو تەمبێ كردن هەیە.

عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، وَقَتَادَةَ، قَالاَ: إِذَا قَالَ: يَا سَارِقُ، يَا مُنَافِقُ، يَا كَافِرُ، يَا شَارِبَ الْخَمْرِ قَالَ: فِي هَذَا كُلِّهُ تَعْزِيرٌ.(١)

جا وەك بینیتان وتیان گەر كەسێك بە كەسێكی تر بڵێت دز یان مونافیق یان كافر یان مەشروب خۆر، لە هەموو ئەمانە ئاگادار دەكرێتەوە و تەمبێ دەكرێ تا جارێكی تر وا نەڵێ ، خۆ ئەگەر بە تەكفیر كردنی برا موسڵمانەكەی كافر ببوایەتەوە ئەوا حوكمی ڕیددەیان لەسەر جێبەجێ دەكرد نەك بڵێن ئاگادار دەكرێتەوە و تەمبێ دەكرێ، كەواتە لای ئەهلی

(١) مصنف عبدالرزاق (١٣٧٤٠).

سوننە ئەم فەرموودەیە بۆ هەڕەشەیە و مەبەست پێی کوفری بچووکە و پێی کافر نابیتەوە، وە کافر بوونەکە بۆ هیچیان ناگەڕێتەوە.

کەواتە لە چوارچێوەی تاوانی گەورەیە و پێی کافر نابیتەوە ئیللا مەگەر بە جائیزی بزانی کە بە برا موسڵمانەکەت بڵێی کافر، وە لات ئاسایی بێت و بە حەڵاڵی بزانی وای پێ بڵێی، ئەو کاتە وەك هەر تاوانێکی تر کە حەڵاڵت کرد دەبێتە کوفرو پێی کافر دەبی، جا بۆیە ئاگاداری خۆتبە لە کردنی ئەم کارەو خۆت بە دوور بگرە لێی، والله اعلم].

**٢٢- (١٠٦٩)** حَدَّثَنَا حَدَّثَنَا أَبُو عَبْدِ اللَّهِ أَحْمَدُ بْنُ عَلِيِّ بْنِ الْعَلاءِ الْجُوزَجَانِيُّ، قَالَ : حَدَّثَنَا زِيَادُ بْنُ أَيُّوبَ الطُّوسِيُّ , قَالَ : حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ , قَالَ : حَدَّثَنَا عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ أَبِي سُلَيْمَانَ , عَنْ سَلَمَةَ بْنِ كُهَيْلٍ , عَنْ عَلْقَمَةَ , وَمَسْرُوقٍ , أَنَّهُمَا سَأَلا ابْنَ مَسْعُودٍ ، عَنِ " الرِّشْوَةِ ، فَقَالَ : هِيَ مِنَ السُّحْتِ ، قَالَ : فَقَالا : أَفِي الْحُكْمِ ؟ قَالَ : ذَلِكَ الْكُفْرُ ، ثُمَّ تَلا هَذِهِ الآيَةَ: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾﴾[1]

واتە: عَلْقَمَة و مَسْرُوق، پرسیاریان لە ابْنَ مَسْعُود (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) کرد دەربارەی بەرتیل، فەرمووی: ئەوە لە سوحتە، وتیان: ئەی لە حوکمدا؟

(١) المائدة (٤٤).

فەرمووی: ئەوە کوفرە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾.

**٢٣- (١٠٧٠)** حَدَّثَنَا حَدَّثَنَا أَبُو شَيْبَةَ عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ جَعْفَرٍ ، قَالَ : حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ , قَالَ : حَدَّثَنَا وَكِيعٌ , قَالَ : حَدَّثَنَا حُرَيْثُ بْنُ أَبِي مَطَرٍ , عَنِ الشَّعْبِيِّ ، عَنْ مَسْرُوقٍ , قَالَ : قُلْنَا لِعَبْدِ اللَّهِ : " مَا كُنَّا نَرَى السُّحْتَ إِلا الرِّشْوَةَ فِي الْحُكْمِ , قَالَ عَبْدُ اللَّهِ : ذَلِكَ الْكُفْرُ ".

واتە: مَسْرُوق دەڵێ: وتمان بە عبداللە بن مسعود (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): ئێمە سوحتمان بە هیچ شتێك نەدەزانی جگە لە بەرتیل وەرگرتن نەبێ لە حوکمدا، عبداللە فەرمووی: ئەوە کوفرە.

**٢٤- (١٠٧١)** حَدَّثَنَا حَدَّثَنَا أَبُو شَيْبَةَ عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ جَعْفَرٍ ، قَالَ : حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ , قَالَ : حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ , عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ , عَنْ حَكِيمٍ , عَنْ سَالِمٍ , عَنْ أَبِي الْجَعْدِ ، عَنْ مَسْرُوقٍ , قَالَ : سَأَلْنَا عَبْدَ اللَّهِ

بْنَ مَسْعُودٍ عَنْ قَوْلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ : " ﴿وَأَكۡلِهِمُ ٱلسُّحۡتَۚ﴾[1] ، قَالَ : الرُّشَا، قَالَ : قُلْتُ : فِي الْحُكْمِ ؟ قَالَ : لا ، ذَلِكَ الْكُفْرُ ".

واتە: مَسْرُوق دەڵێ: پرسیارمان لە عَبْدَاللَّهِ بْنَ مَسْعُود (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) كرد دەربارەی فەرمایشتی الله عز وجل: ﴿وَأَكۡلِهِمُ ٱلسُّحۡتَۚ﴾ ، فەرمووی: بەرتیلە، وتم: لە حوكمدا؟ فەرمووی: نا، ئەوە كوفرە.

[ڕوونكردنەوە: ئەم ئەثەرەی ابن مسعود (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) ئەوەیە كە خەواریجەكان ئیستدلالی پێ دەكەن بۆ (حكم بغیر ما انزل اللّٰه) و دەڵێن كوفری گەورەیە ! ، جا دەڵێم سەیر بكە ئەم ئەثەرە ابن بطة لە ژێر بابی كوفری بچووك هێناویەتی، واتە مەبەستی كافر بوون نییە، بەڵكو هەموو ئەهلی سوننە ئەم ئەثەرەی ابن مسعود یان بە كوفری بچووك لێكداوەتەوە، ئەمە شتێك نییە تەنها ابن بطة هێنابێتی بەڵكو پێش ابن بطة ئیمامی أبو عبید القاسم بن سلام باسی كردووە لەژێر بابی كوفری بچووكدا، هەروەها ابن أبي زمنین یش بابی داناوە بۆ ئەم بابەتانە و بە هەمان شێوە ئەویش لەژێر بابی كوفری بچووك هێناویەتی، وە كەسیش نەبووە هەتا ئەم كاتەی ئێمە تێیداین تانەیان لێ بدات و بڵێ ئێوە كوفری

(١) المائدة (٦٢).

گەورەتان بە كوفرى بچووك لێكداوەتەوە !!! بەڵكو كەس گومانى لەوە نييە كە مەبەست لێى كوفرى بچووكە ئيللا خەواريج نەبێت كە بە تاوان تەكفيرى خەڵكى دەكەن ئيستدلال بەم ئەثەرە و هاوشێوەكانى دەكەن بۆ فكرەكەى خۆيان بەڵام هەمووى پێچەوانەى فكرەى ئەوانە و پاڵپشتيان ناكات بەڵكو لە دژيانە، وە چەندين ئەثەرى تريش هەيە كە پاڵپشتى ئەمە دەكات كە مەبەست لە كوفرى بچووكە نەك گەورە، هەر وەكوو كاتێك پرسيار لە ابن عباس دەكەن دەربارەى ئەو پياوەى لەدواوە دەچێتە لاى خێزانەكەى ئەويش دەڵێ ئەمە پرسيارم لێ دەكات دەربارەى كوفر ! ، ئاشكرايە كە چوونە لاى ئافرەت لە دواوە كوفر نييە بەڵكو تاوانە كە ابن عباس بە كوفرى ناو دەبات، وە هەندێ لە تاوانە گەورەكان بەم شێوەيە بە كوفر ناوبراوە، هەر بۆيە ئەمەش لە چوار چێوەى تاوانە و لە كوفرى بچووك ناچێتە دەرەوە، هەر ئەوەى كە ابن بطة لەژێر ئەم بابەدا هێناويەتى كافيە كە تێ بگەين كوفرى بچووكە، هەروەها ئەمە ڕەددى ئەوانەشە كە دەڵێن خيلاف هەبووە لە نێوان هاوەڵان لە بابەتى (حكم بغير ما انزل الله) و ابن مسعود وتويەتى كوفرى گەورەيە و ابن عباس وتويەتى كوفرى بچووكە، بێگومان ئەم قسەيە جەهلە بە عەقيدەى هاوەڵان چونكە هەم وتەكەى ابن مسعود كە مەبەست ئەم ئەثەرەبوو كە باسمان كرد هەم وتەكەى ابن عباس يش هەردووكيان مەبەستيان كوفرى بچووكە و ابن بطة دواى هێنانى وتەكەى ابن مسعود وتەكەى ابن عباس يش دێنێ هەر لەم بابەدا كە بۆ

كوفرى بچووكى داناوە، جا لێرەوە فكرەو درۆى مارقەكان هەڵدەوەشێتەوە كە گومان دەخەنە سەر عەقيدەى هاوەڵان، لەوەى كە دەڵێن خيلافيان هەبووە لە كوفرو ئيماندا، ئەم درۆيەشيان هەڵدەوەشێتەوە بە ئيزنى الله تعالى و خۆيان ناگرن چونكە پەتى درۆ كورتە، والله اعلم].

**٢٥- (١٠٧٢)** حَدَّثَنَا أَبُو شَيْبَةَ ، قَالَ : حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ , قَالَ : حَدَّثَنَا وَكِيعٌ, عَنْ سُفْيَانَ , عَنْ مَعْمَرٍ , عَنِ ابْنِ طَاوُسٍ , عَنْ أَبِيهِ , عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ : ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ٤٤﴾[1]، قَالَ : هِيَ بِهِ كُفْرٌ, وَلَيْسَ كَمَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ , وَمَلائِكَتِهِ , وَكُتُبِهِ , وَرُسُلِهِ ".

واته: ابْنِ عَبَّاس (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) دەربارەى وتەى الله تعالى: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ٤٤﴾ ، فەرمووى: ئەمە كوفرە، بەڵام وەك ئەو كەسە نييە كە كافرە بە الله و فريشتەكانى و كتێبەكانى و پێغەمبەرانى.

---

(١) المائدة (٤٤).

بَابُ: (ذِكْرِ الذُّنُوبِ الَّتِي تَصِيرُ بِصَاحِبِهَا إِلَى كُفْرٍ غَيْرِ خَارِجٍ عَنِ الْمِلَّةِ) / باسکردنی ئەو تاوانانەی کە خاوەنەکەی توشی کوفرێك دەکات لە دین نایباتە دەرەوە.

**٢٦- (١٠٧٣)** حَدَّثَنَا أَبُو شَيْبَةَ , قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ , قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ , قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ , عَنْ سَعِيدٍ الْمَكِّيِّ , عَنْ طَاوُسٍ: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ٤٤﴾[1] قَالَ: «لَيْسَ بِكُفْرٍ يَنْقُلُ عَنِ الْمِلَّةِ»

واتە: طَاوُس بن کیسان دەربارەی وتەی الله تعالی: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ٤٤﴾، فەرمووی: کوفرێك نییە لە دین دەرخەر بێت.

**٢٧- (١٠٧٤)** حَدَّثَنَا أَبُو شَيْبَةَ , قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ , قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ , قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ , عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ , عَنْ عَطَاءٍ , قَالَ: «كُفْرٌ دُونَ كُفْرٍ , وَظُلْمٌ دُونَ ظُلْمٍ , وَفُسُوقٌ دُونَ فُسُوقٍ»

واتە: عَطَاءٍ بن أبي رباح فەرمووی: کفر دون کفر، وظلم دون ظلم، وفسوق دون فسوق.

(١) المائدة (٤٤).

بَابُ: (ذِكْرِ الذُّنُوبِ الَّتِي تَصِيرُ بِصَاحِبِهَا إِلَى كُفْرٍ غَيْرِ خَارِجٍ عَنِ الْمِلَّةِ) / باسکردنی ئەو تاوانانەی کە خاوەنەکەی توشی کوفرێك دەکات لە دین نایباتە دەرەوە.

**٢٨- (١٠٧٥)** حَدَّثَنَا أَبُو شَيْبَةَ , قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ , قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ , قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ , عَنْ مَنْصُورٍ , عَنْ إِبْرَاهِيمَ: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾﴾[1] ، قَالَ: نَزَلَتْ فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ , وَرُضِيَ لَكُمْ بِهَا.

واتە: إبراهيم النَخَعي دەربارەی وتەی الله تعالى: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ ، فەرمووی: دەربارەی بەنی ئیسرائیل دابەزیوە، وە ڕازی بووە پێی بۆ ئەم ئوممەتەش.

[ڕوونکردنەوە بۆ ئەثەری (١٠٧٥): واتە گەر ئێوەش هەمان کاری ئەوان بکەن هەمان حوکمی ئەوانتان هەیە سەیری ڕوونکردنەوەی ئەثەری (١٠٧٩) بکەن بۆ زیاتر تێگەشتن].

(١) المائدة (٤٤).

**٢٩- (١٠٧٦)** حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ مَحْمُودٍ الصَّفَّارُ , قَالَ: حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنْصُورٍ الرَّمَادِيُّ , قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ , قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْمَرٌ , عَنِ ابْنِ طَاوُسٍ, عَنْ أَبِيهِ , قَالَ: سُئِلَ ابْنُ عَبَّاسٍ عَنْ قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ٤٤﴾[١] قَالَ: «هِيَ بِهِ كُفْرٌ» قَالَ ابْنُ طَاوُسٍ: لَيْسَ كَمَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ، وَمَلَائِكَتِهِ، وَكُتُبِهِ، وَرُسُلِهِ.

واتە: ابْنِ طَاوُس، لە باوكيەوە (طَاوُس) دەڵێ: پرسيار كرا لە ابْنِ عَبَّاس (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) دەربارەی وتەی الله تعالى: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ٤٤﴾، فەرمووی: ئەمە كوفرە. ابن طاوس وتی: وەك ئەو كەسە نييە كە كافرە بە الله و فريشتەكانی و كتێبەكانی و پێغەمبەرانی.

**٣٠- (١٠٧٧)** حَدَّثَنَا أَبُو الْحُسَيْنِ إِسْحَاقُ بْنُ أَحْمَدَ الْكَاذِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَحْمَدَ , قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ , عَنْ هِشَامِ بْنِ حُجَيْرٍ , عَنْ طَاوُسٍ , قَالَ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: لَيْسَ بِالْكُفْرِ الَّذِي تَذْهَبُونَ إِلَيْهِ , قَالَ

(١) المائدة (٤٤).

سُفْيَانُ: أَيْ لَيْسَ كُفْرًا يَنْقُلُ عَنِ الْمِلَّةِ: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ٤٤﴾[1].

واته: طَاوُس دەڵێ: ابْنِ عَبَّاس (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُما) فەرمووی: ئەو کوفرە نییە کە ئێوە بۆی دەچن. سفيان بن عيينة وتی: واتا: کوفرێك نییە لە دین دەرخەر بێت: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ٤٤﴾.

**٣١- (١٠٧٨)** حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ الْكَاذِيُّ , قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَحْمَدَ , قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ , قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ , عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ , عَنْ عَطَاءٍ , قَالَ: كُفْرٌ دُونَ كُفْرٍ , وَظُلْمٌ دُونَ ظُلْمٍ , وَفُسُوقٌ دُونَ فُسُوقٍ.

واته: عَطَاءٍ بن أبي رباح فەرمووی: كفر دون كفر، وظلم دون ظلم، وفسوق دون فسوق.

(١) المائدة (٤٤).

**٣٢- (١٠٧٩)** حَدَّثَنَا أَبُو شَيْبَةَ , قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ , قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ , قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ , عَنْ حَبِيبِ بْنِ أَبِي ثَابِتٍ , عَنْ أَبِي الْبَخْتَرِيِّ , قَالَ: قِيلَ لِحُذَيْفَةَ: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾﴾[1] , نَزَلَتْ فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ , فَقَالَ حُذَيْفَةُ: نِعْمَ الْإِخْوَةُ لَكُمْ بَنُو إِسْرَائِيلَ , إِنْ كَانَتْ لَكُمْ كُلُّ حُلْوَةٍ , وَلَهُمْ كُلُّ مُرَّةٍ , لَتَسْلُكُنَّ طَرِيقَهُمْ قَدْرَ الشِّرَاكِ.

واتە: أَبِي الْبَخْتَرِيِّ، دەڵێ: وترا بە حُذَيْفَة (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ ، ئەم ئایەتە دەربارەی بەنی ئیسرائیل دابەزی، حُذَيْفَة فەرمووی: باشترین برا بۆ ئێوە بەنی ئیسرائیلە، ئەگەرچی هەموو شیرینیەك بۆ ئێوە بێت، وە هەموو تاڵیەك بۆ ئەوان بێت، ئێوەش ڕێبازی ئەوان دەگرنە بەر بە قەدەر قەیتانی پێڵاو.

(١) المائدة (٤٤).

[ڕوونکردنەوە بۆ ئەثەری (١٠٧٩): مەبەستی حُذَيْفَة ئەمەیە کە ئێوەش گەر هەمان کاری ئەوان بکەن ئەوا هەمان حوکمی ئەوان دەتانگرێتەوە، ناکرێ هەردووکتان یەك کار ئەنجام بدەن و سزاکەش تەنها بۆ ئەوان بێت و ئێوە نەگرێتەوە، جا هەر کەسێك وەك یەهود حوکمی اللّٰه بگۆڕێت و ئینکاری لێ بکات ئەوا حوکمی ئایەتەکە ئەوانیش دەگرێتەوە، واتە پێی کافر دەبن گەر وەك یەهوود بکەن کە حوکمی ڕەجمیان گۆڕی و وتیان لە تەوراتدا حوکمی وای تیا نییە، بەڵکو لە بری ئەوە ڕوخسار ڕەشکردن و گێڕانیەتی بەناو خەڵکیدا، بەمەش کافر بوون، جا هەر کەسێك بە هەمان شێوەی ئەوان بکات ئەوا کافرە وەك ئەوان، واللّٰه اعلم].

٣٣- **(١٠٨٠)** حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ الْكَاذِيُّ , قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ , قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ , قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ , عَنْ مَنْصُورٍ , عَنْ سَالِمِ بْنِ أَبِي الْجَعْدِ , عَنْ مَسْرُوقٍ , عَنْ عَبْدِ اللَّهِ , قَالَ: الْجَوْرُ فِي الْحُكْمِ كُفْرٌ , وَالسُّحْتُ الرُّشَا " قَالَ: فَسَأَلْتُ إِبْرَاهِيمَ , فَقُلْتُ: أَفِي قَوْلِ عَبْدِ اللَّهِ: السُّحْتُ رُشَا؟ قَالَ: نَعَمْ.

واتە: مَسْرُوق دەگێڕێتەوە لە عَبْدِاللَّهِ بن مسعود (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ)، فەرموویەتی: زوڵم لە حوکمدا کوفرە، وە سوحتیش بەرتیلە " مَسْرُوق

دەڵێ: پرسیارم كرد لە إِبْرَاهِيمَ النخعي، پێموت: ئەم وتەی عَبْدِاللَّه واتە: سوحت بەرتیلە؟ فەرمووی: بەڵێ.

[ڕوونكردنەوە: سەیركە ئەمە ئەو ئەثەرانە بوو دەربارەی (حكم بغير ما انزل الله) لە ابن عباس و تابعینەكانەوە هاتووە، وەك دەبینن ابن بطة هەمووی لەژێر ئەم بابەدا هێناوە كە دایناوە بۆ كوفری بچووك، كەواتە عەقیدەی خەواریجەكانی بە تەواوی تەفروتونا كرد كە دەڵێن خیلاف لە نێوان هاوەڵان هەبووە لەم بابەتەدا و وتەكەی ابن مسعود و ابن عباس یان (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُم) دەهێنا دەیان دا بە گژی یەكداو دەیان وت پێچەوانەی یەكترە، جا لێرە ابن بطة هەردوو وتەكەی لەژێر هەمان باب دا هێناوە و ئەمەش هەڵوەشاندنەوەی فكرو چەواشەكاری خەواریجەكانە كە ناگەڕێنەوە بۆ تێگەشتنی سەلەف و عەقڵی خۆیان و شێخەكانیان وەك موعتەزیلە كردووە بە حاكم بەسەر دەقەكانەوە و هیچ حساب بۆ فەهم و تێگەیشتنی سەلەف ناكەن هەر بۆیە ڕێگای ڕاستیان ون كردوو گومڕا بوون، شەرمیش ناكەن دێن دەڵێن ئەم ئەثەرانە زەعیفە ! بەڕاستی جێگای شەرمە باسی زوعفی ئەثەر بكرێ لە كاتێكدا هەموو زانایانی سەلەف بێ جیاوازی وەریان گرتووە كەسیان نەیان وتووە زەعیفە، تەنانەت مارقەكانی كۆنیش لەسەردەمی سەلەف باسی زوعفی ئەثەرەكانیان نەكردووە، بەڵكو بێ باسكردنی ئەوە ڕەتیان كردۆتەوە چونكە لەگەڵ فكری خۆیان نەگونجاوە، ئینجا ئەم ئەثەرانە گەر

كەسێك بۆنی عیلمی كردبێ دەبینێ و دەزانێ كە ڕیجالەكانی ناو ئیسنادەكانی هەموویان ئیمام و متمانە پێ كراون هیچ مەجالێك بۆ ئەوە نییە كە بە زەعیف دابنرێ، وە هەموو زانایانی سەلەف جاهیل نەبوونە بە علومی حدیث و ئەثەر و بچن دینداری بە شتێكەوە بكەن كە زەعیف بووبێ، گەر كەسێك تۆزقاڵێ عەقڵی هەبێت ناڵێ ئەم ئەثەرانەی لەم بابەتە هاتووە زەعیفە چونكە بەڕاستی ئەوە تەنها حەیاچوونی خۆیەتی گەر وا بڵێت، ئینجا مارقەكان دێن دەست دەگرن بەو ئەثەرەی كە [سفيان بن عيينة لە هِشَامِ بْنِ حُجَيْرٍ] ڕیوایەتی كردووە، جا مارقەكان باسی ئەثەرەكانی تر ناكەن و تەنها و تەنها جەخت لەسەر ئەمە دەكەنەوە تا بابەتەكە ڕەت بكەنەوە، ئەو ئەثەرەی لە هیشامەوە ڕیوایەت كراوە لێرە بە ژمارە (١٠٧٧) ابن بطة هێناویەتی، گەر دیقەت بدەن دوای ئەوەی سفيان بن عيينة ڕیوایەتی دەكات لە هیشامەوە تا دەگاتە ابن عباس كە دەفەرمووێ: ئەو كوفرە نییە كە ئێوە بۆی دەچن، دوای ئەمە ئیمامی سفيان بن عيينة وەك مارقەكان ناڵێ ئەم ئەثەرە هیشامی تیایە و زەعیفە ! بەڵكو دوای نەقڵ كردنی ئەثەرەكە خۆشی ڕوونكردنەوەی لەسەر دەدات و دەڵێ، واتە كوفرێك نییە لە دین دەرخەر بێت، وە ئایەتەكەش دەخوێنێتەوە، كەواتە ئیمامی سفيان نەك باسی زوعفی هیشامی نەكرد بەڵكو خۆشی شەرحی بۆ ئەثەرەكە كرد، وە مەعلومە كە لای زانایان كار بەو ئەثەرە كراوە و كەسیش نەیوتووە هیشام زەعیفە كەچی ئێستا مارقەكان دێن دەڵێن ئەثەرەكەی ابن عباس زەعیفە چونكە هیشامی

تیایە ! ئێ باشە بێ عەقڵی مارقانە کێ لە پێش ئێوە لە سەلەف وتی کە ئەو ئەثەرە زەعیفە؟، خۆ گەر ئەوەش زەعیف بێت ئەوە چەندین ڕیوایەتی تری لێوە هاتووە کە هیشامی تیا نییە، وە ابن بطة ڕیوایەتەکانی تریشی هێناوە ئیتر چ بیانوویەکتان ماوە تا بڵێن زەعیفە ! هەر بۆ زانیاریتان ئیمامی بوخاری و موسلم لە صحیحەکەیان ڕیوایەتیان هێناوە لە هیشامەوە، دەزانم لاتان سەیرە چونکە هیشام زەعیفە لە حدیث ئیتر چۆن دەبێ لە صحیحین فەرموودەی لێوە هاتبێ ! هیشام گەر موشاهیدی هەبووبێ لە فەرموودەی تر ئەوە فەرموودەی لێ وەرگیراوە وەك ئیمامی بوخاری بە ژمارە (٦٧٢٠) فەرموودەیەکی لە سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ حُجَيْرٍ، ڕیوایەت کردووە هەمان فەرموودەی بە ڕێگەیەکی تر لە غەیری هیشام ڕیوایەت کردووە بۆ موتابەعەی فەرموودەکەی هیشام، وە ئیمامی بوخاری نەیوت ئەم فەرموودەیە مادەم لە هیشامەوەیە زەعیفە و ڕیوایەتی ناکەم بەڵکو چونکە موتابەعەی هەبوو لە فەرموودەی تر نەقڵی کرد بێ ئەوەی بڵێ زەعیفە، هەروەها ئیمامی موسلم لە صحیحەکەی بە ژمارە (١٢٤٦-١٦٥٤) دوو فەرموودەی نەقڵ کردووە لە ڕێگەی سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ حُجَيْرٍ، وە هەمان فەرموودەی لە ڕێگای ترەوە نەقڵ کردووە و ئەوەی هیشامیشی بە زەعیف دانەناوە، چونکە لە ڕێگەی ترەوە لێوەی هاتووە و کێشەی نییە، جا ئەمە گەر بۆ فەرمووده وابێ بێگومان بۆ تەفسیر لە پێشترە کە لێی وەربگیرێ لە کاتێکدا لە تەفسیرەکەدا ڕێگای زۆر زیاتر هەیە لەوەی هیشام و ئەوەی هیشامیش موتابعی ئەوانە و هیچ کێشەی

تێدا نییە وەك لە ڕیوایەتەکان دەردەکەوێ کە ابن بطة هێناویەتی تەنها یەك ئەثەر لە هیشامەوە هاتووە ئەوانەی تر لە کەسانی ترەوە هاتووە کە هیچ قسەیەك هەڵناگرێ و هەموویان جێگای متمانەن و ئیمامن و ئەوەی تانەیان لێ بدات تەنها حەیای خۆی دەبات و هیچی تر.

جا سەیرکەن ئیمامی سفیان بن عیینة چی دەفەرمووێ لەسەر ئەوانەی لە هیشامیان وەرگرتووە:

**سفیان بن عیینة دەفەرمووی:** لە هِشام بن حُجَیر ەوە وەرمان نەگرتووە، ئیللا ئەوە نەبێت کە لەلای غەیری خۆی هەیە.

**قال سُفيان بن عُيَينَة:** لَم نَكُن نَأخُذ عن هِشام بن حُجَير ، إلا ما لا نَجِدُه عِند غَيرِهِ.[١]

قسەکەی زۆر ڕوونە بەهەمان شێوەش بوخاری و موسلم ئەوەیان لێ وەرگرتووە کە لەلای غەیری خۆشی هەبووە وەك چۆن ڕوونمان کردەوە، جا ئەم ئەثەرەش کە هیشامی تێدایە موتابعی غەیری خۆی هەیە و بێ هیچ کێشەیەك وەردەگیرێ هەر وەك سەلەف تێکڕا وەریان گرتووە و تانەیان

(١) الضعفاء للعقيلي (٦٣٥١).

لێ نەداوە، هێندە كافییە بۆ كەسێك كە عەقڵ و هۆشی لەكار نەكەوتبێ، الله تعالى بمان پارێزێت لەوەی كە شوێن هەواو ئارەزووی خۆمان بكەوین و پێچەوانەی ئەوە بكەین كە باشترینەكانی سەر زەوی لەسەری بوون و دینداریان پێوە كردووە، وە حەز ناكەم باسی ئەوەش بكەم كە هەندێك نەزانی گەمژە دەڵێن گەر وشەی كوفر (ال) پێوە بوو ئەوا كوفری گەورەیە ! ئەم قسەیە هەر شایەنی ئەوە نییە باسی لێوە بكەین چونكە ئەو كوفرانەی لێرە ابن بطة هێنای زۆربەی (ال) پێوە بوو، وە هەر مەبەستی كوفری بچووكیشە و هیچی لە باسەكە نەگۆڕی.

جا بابەتی (الحكم بغير ما أنزل الله) واتە حوكم كردن بە غەیری شەرع لە بابەتە فروعیەكان (وەك: دەست بڕینی دز و جەڵد لێدان و ڕەجمی زیناكارو، هتد ...) نەك بابەتە ئصوڵیەكان (وەك: تەوحید و بەشەكانی و حەڕام و حەڵاڵەكان و هەتا دوایی) كوفری بچووكە، وە باسی ئەثەرەكانمان كرد و ڕوونمان كردەوە كە صحیحە و هیچ كێشەی نییە لە ڕووی وەرگرتن و صحیحیەوە، ئەمما بە پێویستم زانی ئاماژە بەوە بدەم كە ئەم بابەتی (كفر دون كفر)ە بۆ حاكمێكی موسڵمانە كە شەرعی نەگۆڕیبێت بە یاسای كوفری دیموكراسی كە پڕە لە چەندین كوفر و هیچ موەحیدێك نییە ئینكاری لێ بكات، وە حوكم كردن بە كوفر لە هەموو حاڵەتێك كوفرە و هیچ مەجالی تێدا نییە، ئەمما خودی (الحكم بغير ما أنزل الله) لە ئەسڵدا كوفری بچووكە و تاوانە، بۆ نموونە

حاكمێك دەستی دزێك نەبڕێت بەڵام بڕوای بە دەست بڕین هەبێت و دانی پێدا بنێت و ئینكاری نەكات، یان گاڵتە بە حوكمی الله نەكات، یان بە حەڵاڵی نەزانێت كە حوكم بە غەیری شەرع بكات و خۆی بە تاوانبار بزانێت كە حوكمی بە غەیری شەرع كردووە، ئەوە لەم حاڵەتەدا كافر نابێت و تاوانبارە وەك هەر تاوانێكی تر، بەڵام ئەگەر هاتوو حوكم كردنی بە غەیری شەرع بە حەڵاڵ زانی، یان گاڵتەی بە حوكمی الله كرد، یان حوكمی الله ی گۆڕی وەك یەهود، یان حوكمی خۆیی وەك حوكمی الله سەیر كرد، یان بە سووك سەیری حوكمی الله ی كرد، ئەوە لە هەر حاڵەتێك لەم حاڵەتانە بوو ئەو كەسەی حوكمی پێ دەكات كافر دەبێت و هیچ عوزری نییە، جا بۆیە كاتێك دەڵێین (الحكم بغير ما أنزل الله) كوفری بچووكە، ئەوە مەبەستمان لە حوكم كردنە بە حدودەكان نەك لەو باسانەی كە پەیوەستن بە تەوحیدەوە، ئەویش بەو مەرجانەی كە باسمان كرد، وە دیسان تەئكیدی دەكەمەوە كە دیموكراسی كوفرێكی ئاشكرایە و ئەوەی حوكمی پێ بكات كافرەو هیچ رێزێكی نییە، جا بۆیە هیچ كەسێك تۆمەت نەداتە پاڵمان كە بڵێ ئەم حوكمەتانەی ئێستا بە كافر نازانن و پێتان موسڵمانن، حاشا والله ئێمە لەو فكرە پیس و بۆگەنە بەرین كە فكرەی مەدخەلیەكانە كە خزمەتكاری طاغوتانن بۆیە كەس نەیداتە پاڵمان.

داواكارین لە الله تعالى هیدایەتی ئێمە و ئەوانەش بدات كە رێگەكەیان ون كردووە و لا رێ بوون بۆ سەر رێگای ڕاست، ئامین].

**٣٤- (١٠٨١)** حَدَّثَنَا أَبُو الْحُسَيْنِ بْنُ أَحْمَدَ الْكَاذِيُّ , قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَحْمَدَ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: حَدَّثَنا أَبُو كَامِلٍ , قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادٌ , قَالَ: حَدَّثَنَا حَكِيمٌ الْأَثْرَمُ , عَنِ أَبِي تَمِيمَةَ الْهُجَيْمِيِّ , عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ , قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «مَنْ أَتَى حَائِضًا , أَوِ امْرَأَةً فِي دُبُرِهَا , أَوْ كَاهِنًا , فَصَدَّقَهُ بِمَا يَقُولُ , فَقَدْ بَرِئَ مِمَا أُنْزِلَ عَلَى مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ»

واته: أَبِي هُرَيْرَة (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) دەڵێ: پێغەمبەری الله (ﷺ) فەرموویەتی: هەر کەسێك بچێتە لای ئافرەتێك لە حەیزدا بێت، یان بچێتە لای ئافرەتێك لە دواوە، یان بچێتە لای کاهینێك، جا بڕوا بەوە بکات کە دەیڵێت، ئەوا بەریئ بووە بەوەی کە بەسەر محمد (ﷺ) دابەزیوە.

**٣٥- (١٠٨٢)** حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ الْكَاذِيُّ , قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَحْمَدَ , قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي , وَحَدَّثَنَا الصَّفَّارُ , قَالَ: حَدَّثَنَا الرَّمَادِيُّ , قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ , قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ , عَنِ ابْنِ طَاوُسٍ , عَنْ أَبِيهِ , قَالَ: سُئِلَ ابْنُ عَبَّاسٍ عَنِ الَّذِي يَأْتِي امْرَأَتَهُ فِي دُبُرِهَا, فَقَالَ: «هَذَا يَسْأَلُنِي عَنِ الْكُفْرِ»

واتە: عَبْدُ الرَّزَّاق دەڵێ: مَعْمَر هەواڵی پێداین لە ابْنِ طَاوُس، لە باوکیەوە [طاوس] فەرموویەتی: پرسیار کرا لە ابْنُ عَبَّاس (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) دەربارەی ئەو پیاوەی کە لە دواوە دەچێتە لای ژنەکەی؟، فەرمووی: ئەمە پرسیارم لێ دەکات دەربارەی کوفر.

**٣٦- (١٠٨٣)** حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ الْكَاذِيُّ , قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَحْمَدَ , قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ , عَنْ قَتَادَةَ , عَنْ عُقْبَةَ بْنِ وَسَّاجٍ , عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ , قَالَ: لَا يَفْعَلُ ذَلِكَ إِلَّا الْكَافِرُ.

واتە: أَبِي الدَّرْدَاء (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) دەفەرمووێ: هیچ کەسێك ئەم کارە ناکات جگە لە کافر [واتە چوونە لای ئافرەت لە دواوە].

**٣٧- (١٠٨٤)** حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ , قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَحْمَدَ , قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ , عَنْ لَيْثٍ , عَنْ مُجَاهِدٍ , قَالَ: قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: مَنْ أَتَى الرِّجَالَ وَالنِّسَاءَ فِي أَعْجَازِهِنَّ , فَقَدْ كَفَرَ.

واتە: مُجَاهِد دەڵێ: أَبُو هُرَيْرَة (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) فەرموویەتی: هەر کەسێك لە دواوە بچێتە لای پیاوان و ئافرەتان، ئەوا کافر بووە.

**٣٨- (١٠٨٥)** حَدَّثَنِي أَبُو صَالِحٍ مُحَمَّدُ بْنُ أَحْمَدَ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الْأَحْوَصِ , قَالَ: حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ , قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ , عَنْ لَيْثٍ , عَنْ مُجَاهِدٍ , عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ , قَالَ: «إِتْيَانُ أَدْبَارِ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ كُفْرٌ»

واتە: لە مُجَاهِد، لە أَبِي هُرَيْرَة (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) فەرموویەتی: چوونە لای پیاوان و ئافرەتان لە دواوە كوفرە.

**٣٩- (١٠٨٦)** حَدَّثَنَا أَبُو عَلِيٍّ مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ الْبَيِّعُ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ خَلَفٍ , قَالَ: حَدَّثَنَا حَجَّاجُ بْنُ مِنْهَالٍ , قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ , قَالَ: حَدَّثَنَا يُونُسُ, عَنِ الْحَسَنِ , وَابْنِ سِيرِينَ , عَنْ أَبِي بَكْرَةَ , أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «لَا تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّارًا (أَوْ قَالَ أَحَدُهُمَا ضُلَّالًا) يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ»[١]

(١) ئەم فەرموودەیە ئیمام أحمد لە مسند بە ژمارە (٢٠٣٦) ، والبخاري (١٢١-٧٠٨٠)، ومسلم (١٦٧٩) لە صحیحەكەیان هێناویانە.

واته: أَبِي بَكْرَة (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری الله (ﷺ) فەرموویەتی: دوای من مەگەڕێنەوە كافر ببنەوە (یان یەكێكیان وتی: گومڕا ببنەوە) هەندێكتان بدەن لە گەردنی هەندێكتان.

**٤٠- (١٠٨٧)** حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ مُحَمَّدُ بْنُ بَكْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ , قَالَ: حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ, قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَارِثِ , عَنْ أَيُّوبَ , عَنْ مُحَمَّدٍ , عَنْ أَبِي بَكْرَةَ , قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «لَا تَرْجِعُوا بَعْدِي ضُلَّالًا»(١)

واته: أَبِي بَكْرَة (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) دەڵێ: پێغەمبەری الله (ﷺ) فەرموویەتی: دوای من مەگەڕێنەوە گومڕا ببنەوە.

**٤١- (١٠٨٨)** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَكْرٍ , قَالَ: حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ , قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ , عَنْ قُرَّةَ , قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ , عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ, عَنْ رَجُلٍ , آخَرَ هُوَ فِي نَفْسِي أَفْضَلُ مِنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ , عَنْ أَبِي بَكْرَةَ , أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَطَبَ النَّاسَ بِمِنًى فَقَالَ: «لَا تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّارًا يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ»(٢)

---

(١) ئەم فەرموودەیە مسلم لە صحیحەكەی بە ژمارە (١٦٧٩) هێناویەتی.

(٢) ئەم فەرموودەیە ئیمام أحمد لە مسند بە ژمارە (٢٠٤٠٧) هێناویەتی.

واتە: أَبِي بَكْرَة (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری الله (ﷺ) وتاری بۆ خەڵکی دەدا لە مینا، فەرمووی: دوای من مەگەڕێنەوە کافر ببنەوە هەندێکتان بدەن لە گەردنی هەندێکتان.

**٤٢- (١٠٨٩)** حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْمَاعِيلَ الْآدَمِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ بُدَيْلٍ الْأَيَامِيُّ , قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ نُمَيْرٍ , قَالَ: حَدَّثَنَا فُضَيْلُ بْنُ غَزْوَانَ, عَنْ عِكْرِمَةَ , عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ , قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي حِجَّةِ الْوَدَاعِ: «لَا تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّارًا يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ»[١]

واتە: ابْنِ عَبَّاس (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) دەڵێ: پێغەمبەری الله (ﷺ) لە حەجی ماڵئاوایی فەرمووی: دوای من مەگەڕێنەوە کافر ببنەوە هەندێکتان بدەن لە گەردنی هەندێکتان.

**٤٣- (١٠٩٠)** حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ أَحْمَدَ الْكَاذِيُّ أَبُو الْحُسَيْنِ , قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَحْمَدَ , قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ , عَنْ يَعْلَى بْنِ عَطَاءٍ , عَنْ

(١) ئەم فەرموودەیە ئیمام أحمد لە مسند بە ژمارە (٢٠٣٦) هێناویەتی.

مُجَاهِدٍ , قَالَ: غِبْتُ عَنِ ابْنِ عُمَرَ , فَلَمَّا قَدِمْتُ أَتَيْتُهُ بَعْدَ ذَلِكَ قَالَ: فَقَالَ لِي: أَشَعَرْتَ أَنَّ النَّاسَ كَفَرُوا بَعْدَكَ؟ يَعْنِي: قَتَلَ بَعْضُهُمْ بَعْضًا.

واتە: مُجَاهِد دەڵێ: ڕۆشتم لای ابْنِ عُمَر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، کاتێك گەڕامەوە هاتمەوە بۆ لای دوای ئەوە وتی: پێی وتم: ئایا هەستت کرد کە خەڵکی کافر بوونەوە دوای تۆ؟ واتە: هەندێکیان هەندێکیانیان کوشت.

٤٤- **(١٠٩١)** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَكْرٍ , قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ , قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ هِشَامُ بْنُ عَبْدِ الْمَلِكِ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ , قَالَ: وَاقِدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ أَخْبَرَنِي عَنْ أَبِيهِ , أَنَّهُ سَمِعَ ابْنَ عُمَرَ , يُحَدِّثُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: «لَا تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّارًا يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ»[١]

واتە: شُعْبَة دەڵێ: وَاقِدُ بْنُ عَبْدالله هەواڵی پێدام لە باوکیەوە، کە بیستوویەتی ابْنَ عُمَر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) دەیگێڕایەوە لە پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرموویەتی: دوای من مەگەڕێنەوە کافر ببنەوە هەندێکتان بدەن لە گەردنی هەندێکتان.

(١) ئەم فەرموودەیە ئیمام البخاري لە صحیحەکەی بە ژمارە (٦١٦٦-٧٠٧٧) ، وأبو داود (٤٦٨٦) لە سنن هێناویانە.

**٤٥- (١٠٩٢)** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَكْرٍ , قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ , قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ قُدَامَةَ بْنِ أَعْيَنَ , قَالَ: حَدَّثَنَا جَرِيرٌ , عَنِ الْأَعْمَشِ , عَنْ شِمْرِ بْنِ عَطِيَّةَ , عَنْ أَشْيَاخٍ , لَهُمْ قَالَ: قَالَ عَلِيٌّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: الْمَكْرُ غَدْرٌ , وَالْغَدْرُ كُفْرٌ.

واتە: عَلِيّ بن أبي طالب (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) دەفەرمووێ: فێڵ کردن زوڵمە، وە زوڵم کردن کوفرە.

**٤٦- (١٠٩٣)** حَدَّثَنَا الْقَاضِي الْمَحَامِلِيُّ , قَالَ: حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ مُوسَى , قَالَ: حَدَّثَنَا جَرِيرٌ , عَنْ مُغِيرَةَ , عَنْ عَامِرٍ , قَالَ: كَانَ جَرِيرٌ يُحَدِّثُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «إِذَا أَبَقَ الْعَبْدُ لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلَاةٌ , وَإِنْ مَاتَ مَاتَ كَافِرًا»[١]

واتە: عَامِر دەڵێ: جَرِير (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) دەیگێڕایەوە لە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ئەگەر بەندەیەك لە گەورەکەی ڕایکرد ئەوە نوێژی لێ وەرناگیرێ، وە ئەگەر بمرێت بە کافری دەمرێت.

(١) ئەم فەرموودەیە ئیمام أحمد لە مسند بە ژمارە (١٩٢٢٥)، ومسلم (٧٠) لە صحیحەکەی هێناویانە.

[أَبَقَ: واتە ڕۆشتنی بەندە لای گەورەكەی بەبێ هيچ ترسێك و بەبێ ئيشپێكردنی قورسيش.

أَبَقَ: ذهبَ العبد بلا خوف ولا كَدِّ عَمَل].[1]

**٤٧- (١٠٩٤)** حَدَّثَنَا أَبُو شَيْبَةَ عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ جَعْفَرٍ , قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ, قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ , عَنْ سُفْيَانَ , عَنْ حَبِيبِ بْنِ أَبِي ثَابِتٍ , عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُبَيْلٍ , عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ , قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «إِذَا أَبَقَ الْعَبْدُ إِلَى الْعَدُوِّ بَرِئَتْ مِنْهُ الذِّمَّةُ»[2]

واتە: جَرِيرِ بْنِ عَبْدِاللَّه (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) دەڵێ: پێغەمبەری الله (ﷺ) فەرموویەتی: ئەگەر بەندەیەك ڕايكرد بۆ لای دوژمن، بەرِیء بووە لەو پەيمان و پاراستنەی پێی دراوە.

**٤٨- (١٠٩٥)** حَدَّثَنَا أَبُو شَيْبَةَ , قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ , قَالَ: قَالَ حَدَّثَنَا وَكِيعٌ, قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ , عَنِ الْحُسَيْنِ بْنِ عُبَيْدٍ , عَنِ الشَّعْبِيِّ , عَنْ جَرِيرٍ , قَالَ: «مَعَ كُلِّ أَبْقَةٍ كُفْرُهُ»

---

(١) تهذيب اللغة (١/١٠٨).

(٢) ئەم فەرموودە ئيمام أحمد لە مسند بە ژمارە (١٩٢١١) هێناويەتی.

واتە: جَرِير (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) دەفەرمووێ: لەگەڵ هەموو ڕاکردنێکدا کوفرێك هەیە. [مەبەستی ڕاکردنی کۆیلەیە لە گەورەکەی یان بۆ لای دوژمن بچێت].

[ڕوونکردنەوە بۆ ئەثەری ژمارە (١٠٩٣) - (١٠٩٤) - (١٠٩٥)، لە یەکەم دەڵێ گەر بەندە ڕای کرد لە گەورەکەی نوێژی لێ وەرناگیرێ و بشمرێ بە کافری دەمرێ، لە دووەم دەڵێ گەر بەندە ڕابکات بۆ لای دوژمن بەریئ بووە لە زیمە واتە پاراستنی لەسەر نەماوە، لە سێیەم دەڵێ لەگەڵ هەموو ڕاکردنێکدا کوفرێك هەیە، جا مەبەستی هەموو ئەمانە کافربوون نییە بەڵکو لە شێوەی توندی و هەڕەشەدا هاتووە و مەبەست پێی کافر بوون نییە بەڵکو لە پلەی تاوانە گەورەکانە، ئەوەش کە دەڵێ ڕابکات بۆ لای دوژمن بەریئ بووە لە زیمە، مەبەست لە بەریئ بوون لە زیمە، زیمەی ئیسلام نییە کە کەسەکە پێی کافر ببێت بەڵکو وەك وتم لە شێوازی توندی و هەڕەشەدا هاتووە هەر وەك ئەو فەرموودەی کە هاتووە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: (مَن باتَ عَلى إجّارٍ لَيْسَ حَوْلَهُ بِناءٌ يَدْفَعُ قَدَمَيْهِ فَهَلَكَ فَقَدْ بَرِئَتْ مِنهُ الذِّمَّةُ، ومَن رَكِبَ البَحْرَ إذا ارْتَجَّ فَقَدْ بَرِئَتْ مِنهُ الذِّمَّةُ)، واتە: هەر کەسێ شەو بمێنێتەوە لە سەربانێك کە ستارەی نییە کەوا پێی خۆی پێ بگرێتەوە و نەکەوێتە خوارەوە ئەگەر بە هیلاك بچێت و بمرێت ئەوە بەریئ

بووە لە زيمە (واتە پاراستن)، وە هەر كەسێ بچێتە ناو بەحرەوە كە دەبينێ شەپۆلی بەرز دەدات و ترسناكە ئەوە بەریئ بووە لە زيمە.

هەروەها گەر بەندەيەك لە گەورەكەی ڕابكات بۆ لای دوژمن بە تەنها بەم ڕاكردنە خوێنی حەڵاڵ ناكات، بەڵكو مەگەر لەگەڵ ڕاكردنەكەيدا مورتەد بێتەوە يان هاوكاری كافران بكات لە شەڕی دژی موسڵمانان لەم حاڵەتەدا تووشی ڕيددە بووە و خوێنی حەڵاڵ دەبێت، ئەمە بۆ بەندەيەك كە موسڵمان بێت، بۆ بەندەی كافريش گەر ڕابكات بۆ لای دوژمن هەر بەو ڕاكردنە خوێنی حەڵاڵ ناكات ئيللا مەگەر هاوكاری كافران بكات و دژی موسڵمانان بجەنگێ ئەوجا خوێنی حەڵاڵ دەبێت.

وەك بينيت ئەم لەفزانە بۆ شتانێك بەكار هاتووە كە هەموو كەسێك دەزانێ كوفر نييە، هەر بۆيە ابن بطة ئەم فەرموودانەی لەژێر ئەم بابەدا هێناوە تا تێمان بگەيەنێت كە ئەمانە تاوانن و كوفر نين لەسەر شێوازی توندی و هەڕەشە وشەی كوفری بۆ بەكار هاتووە، والله اعلم].

**٤٩- (١٠٩٦)** حَدَّثَنَا أَبُو شَيْبَةَ , قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ , قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ , قَالَ: حَدَّثَنَا الْأَعْمَشُ , عَنْ إِبْرَاهِيمَ , عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ , قَالَ: دَخَلَ عَبْدُ اللَّهِ عَلَى امْرَأَتِهِ , فَلَمَسَ صَدْرَهَا , فَإِذَا فِي عُنُقِهَا خَيْطٌ قَدْ عَلَّقَتْهُ فَقَالَ: مَا

هَذَا؟ فَقَالَتْ: شَيْءٌ رُقِيَ لِي فِيهِ مِنَ الْحُمَّى , فَنَزَعَهُ , وَقَالَ: «لَقَدْ أَصْبَحَ آلُ عَبْدِ اللَّهِ أَغْنِيَاءَ عَنِ الشِّرْكِ»

واتە: أَبِي عُبَيْدَة دەڵێ: عَبْدُاللَّهِ بن مسعود (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) چووە لای خێزانی، دەستی دا لە سنگی، بینی پەتێکی لە ملدایە هەڵیواسیوە، عَبْدُاللَّه پێی وت: ئەوە چییە؟، خێزانەکەی وتی: شتێکە ڕوقیەی تێدایە لەبەرئەوەی (تام) هەیە، عَبْدُاللَّه پەتەکەی لە گەردنی کردەوە و پچڕاندی، فەرمووی: خانەوادە و خێزانی عَبْدُاللَّه بێ پێویستن لە شیرك.

٥٠- **(١٠٩٧)** حَدَّثَنَا أَبُو شَيْبَةَ , قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ , قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ , قَالَ: حَدَّثَنَا الْأَعْمَشُ , عَنْ أَبِي ظَبْيَانَ , قَالَ: دَخَلَ حُذَيْفَةُ عَلَى رَجُلٍ مِنْ بَنِي عَبْسٍ يَعُودُهُ , فَلَمَسَ عَضُدَهُ , فَإِذَا فِيهِ خَيْطٌ , فَقَالَ: مَا هَذَا؟ قَالَ: شَيْءٌ رُقِيَ لِي فِيهِ , فَقَطَعَهُ , وَقَالَ: لَوْ مُتَّ وَهُوَ عَلَيْكَ مَا صَلَّيْتُ عَلَيْكَ .

واتە: أَبِي ظَبْيَان دەڵێ: حُذَيْفَة (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) چووە لای پیاوێك سەردانی کرد لە بەنی عَبْس، دەستی دا لە قۆڵی بینی پەتێکی بەستووە پێوەی، پێی فەرموو: ئەمە چییە؟، وتی: شتێکە ڕوقیەی تێدایە بۆم، حُذَيْفَة پچڕاندی و فەرمووی: ئەگەر بمردیتایە و ئەوەت پێوە بوایە نوێژم لەسەرت نەدەکرد.

**٥١- (١٠٩٨)** حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ أَحْمَدَ الْكَاذِيُّ , قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَحْمَدَ, قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ , عَنِ الْأَعْمَشِ , عَنْ أَبِي ظَبْيَانَ , أَنَّ حُذَيْفَةَ , دَخَلَ عَلَى رَجُلٍ يَعُودُهُ , فَرَآهُ قَدْ جَعَلَ فِي عَضُدِهِ خَيْطًا , قَدْ رُقِيَ فِيهِ , فَقَالَ: «مَا هَذَا؟» قَالَ: مِنَ الحُمَّى , فَقَامَ غَضْبَانَ: فَقَالَ: «لَوْ مُتَّ مَا صَلَّيْتُ عَلَيْكَ»

واتە: أَبِي ظَبْيَانَ دەڵێ: حُذَيْفَة (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) سەردانی پیاوێکی کرد بینی لە قۆڵی دا پەتێك هەیە کە ڕوقیەی تێدایە، پێی فەرموو: ئەمە چییە؟، پیاوەکە وتی: لەبەر (تا) دامناوە، حُذَيْفَة هەستا بە تورەییەوە فەرمووی: گەر بمردیتایە نوێژم لەسەرت نەدەکرد.

[ڕوونکردنەوە بۆ ئەثەری ژمارە (١٠٩٦) - (١٠٩٧) - (١٠٩٨)، یەکەم کە دەڵێ خانەوادەی عبداللە بێ پێویستن لە شیرك، بێگومان ئەو کارەی کە خێزانەکەی کردی شیرکی بچووك بوو نەك گەورە، وە هەڵواسینی پەت و ڕوقیە و ئەوانە بۆ نەخۆشی شیرکی بچووکە چونکە وەك هۆکارێك بە کاری دێنی نەك پێت وابێ خودی پەتەکە یان ڕوقیەکە شیفا دێنێ و چارەسەری بەدەستە، گەر پێت وابێ خودی پەت و ڕوقیەکە بێ لە اللە توانای چارەسەریان هەیە ئەوە شیرکی گەورەیە و پێی کافر دەبی بەڵام بەم جۆرەی کە لەم بابەدا هاتووە بێگومان شیرکی بچووکە نەك

گەورە، وە دوو ئەثەرەكەی تریش كە دەڵێ بمردیتایە نوێژم لەسەر نەدەكردی هەر بەوەی كە لەم بابەدا ابن بطة هێناویەتی بەسە بۆ ئەوەی كە تێبگەین لەسەر توندی و هەڕەشە هاتووە و خاوەنەكەی كافر نییەو تاوانبارە، والله اعلم].

٥٢- **(١٠٩٩)** حَدَّثَنَا أَبُو شَيْبَةَ عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ جَعْفَرٍ , قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ, قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ , قَالَ: حَدَّثَنَا عُثْمَانُ الشَّحَّامُ , سَمِعَهُ مِنَ الْحَسَنِ, قَالَ: كَانَ أَبُو الْحَسَنِ يَعْنِي عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ كَرَّمَ اللَّهُ وَجْهَهُ يَقُولُ: «إِنَّ كَثِيرًا مِنْ هَذِهِ التَّمَائِمِ وَالرُّقَى شِرْكٌ بِاللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ , فَاجْتَنِبُوهَا»

واتە: وَكِيع دەڵێ: عُثْمَانُ الشَّحَّام بۆی گێڕاینەوە، بیستوویەتی لە الْحَسَن، وتوویەتی: باوكی حەسەن واتە عَلِيّ بْنَ أَبِي طَالِب كَرَّمَ اللَّهُ وَجْهَهُ، فەرموویەتی: بەڕاستی زۆرێك لە ئەم تەمیمە و ڕوقیانە شیركە بە الله عَزَّ وَجَلَّ، خۆتانی لێ بەدوور بگرن.

٥٣- **(١١٠٠)** حَدَّثَنَا أَبُو مُحَمَّدٍ الْحَسَنُ بْنُ عَلِيِّ بْنِ زَيْدٍ , قَالَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حَرْبٍ , قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ , قَالَ: حَدَّثَنَا الْأَعْمَشُ , عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ , عَنْ يَحْيَى بْنِ الْجَزَّارِ, عَنِ ابْنِ أَخِي زَيْنَبَ , عَنْ زَيْنَبَ , امْرَأَةِ عَبْدِ اللَّهِ , عَنْ

عَبْدِ اللَّهِ , قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: «الرُّقَى , وَالتَّمَائِمُ , وَالتِّوَلَةُ شِرْكٌ»[١]

واته: عَبْدِاللَّه دەڵێ: بیستم پێغەمبەری الله (ﷺ) دەیفەرموو: نوشته و چاوەزار و ئەوەی ژن خۆشەویست دەکات لای مێردەکەی شیرکن.

[ڕوونکردنەوەی: «الرُّقَى , وَالتَّمَائِمُ , وَالتِّوَلَةُ»

**الأصمعي دەڵێ (التِّوَلَة):** بە کەسرەی تاء ئەوەیە کە ژن خۆشەویست دەکات لای مێردەکەی.

**قال الأصمعي (التِّوَلَة):** بكسر التاء وهو الذي يحبِّب المرأة إلى زوجها.[٢]

**هەروەها أبو عُبيد دەڵێ:** مەبەست بە (الرُّقى والتمائم) لە لای من ئەوەیە: کە بەبێ زمانی عەرەبی لەو شتانەیە ماناکەی نازاندرێت، ئەمما ئەوەی ژن خۆشەویست دەکات لای مێردەکەی ئەوە لە لای ئێمە سیحرە.

(١) ئەم فەرموودەیە ئیمام أحمد لە کتاب الإیمان بەژمارە (٣٣٣) هێناویەتی.
(٢) غريب الحديث (٥١/٤).

**وقال أبو عُبيد:** وإنما أراد بالرُّقى والتمائم عندي : ما كان بغير لسان العربية مما لا يُدرَى ما هو ، فأما الذي يُحبب المرأة إلى زوجها فهو عندنا من السِّحر. اهـ.[1]

جا ئایا ئەمەی کە دەوترێ ئەوەی ژن خۆشەویست دەکات لای مێردەکەی سیحرە مەبەست کامە سیحرە؟ ئایا ئەو سیحرەیە کە ساحیرێکی طاغوت دەیکات لە ڕێگەی شەیتان و جنەکانی؟ چۆن دەکرێ ئەم سیحرە کە ساحیرێکی طاغوت دەیکات کوفری بچووك بێت؟!

بێگومان ئەمە ئەو سیحرە نییە کە دەوترێ سیحرە، واتە مەبەستی ئەو جۆرە نییە کە دێ بە مێشکی زۆربەماندا، وە ابن بطة هەڵەی نەکردووە لەوەی کە ئەم فەرموودەیەی لەم بابە هێناوە کە دایناوە بۆ کوفری بچووك بەڵام بە تێگەیشتن لێی وەك خۆی، سیحر جۆری زۆرە و دەکرێ زۆر شت پێی بوترێ سیحر بەڵام مەرج نییە مەبەستی ئەو سیحرە بێت کە کوفرە و لە ڕێگەی شەیتان و جنەکانەوە دەکرێت، لەوەیە تەنها

(١) غريب الحديث (٥١/٤).

مەبەست لە تاکە قسەیەك بێت یان شت هەڵواسین بە خۆتدا شتێك لەو بابەتانە هەر وەك هاتووە لە فەرموودە و وتەی زانایانی سەلەف:

عَبْدِاللَّهِ بْنِ عُمَر (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) دەگێڕێتەوە، کە دوو پیاو لە ڕۆژهەڵاتەوە هاتن وتاریان دا، خەڵکی سەرسام بوون بە ڕەوانبێژیەکەیان، جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بەڕاستی لە ڕەوانبێژی و زمانپاراوی سیحر هەیە یاخود فەرمووی بەڕاستی هەندێك لە ڕەوانبێژی سیحرە.

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ قَدِمَ رَجُلَانِ مِنَ الْمَشْرِقِ فَخَطَبَا، فَعَجِبَ النَّاسُ لِبَيَانِهِمَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " إِنَّ مِنَ الْبَيَانِ لَسِحْرًا ". أَوْ: " إِنَّ بَعْضَ الْبَيَانِ لَسِحْرٌ ". [١]

زۆر ڕوونە ئەم کارەی کە پێغەمبەر (ﷺ) ناوی لێنا سیحر هیچ کوفرو شیرکێکی تێدا نییە، بەڵکو مەبەست لەوەی کە فەرمووی سیحرە، چۆنیەتی قسەزانی و جوانی قسەکانیان بووە کە خەڵکیان سەرسام کردووە بۆیە فەرمووی سیحرە.

(١) صحيح البخاري (٥٧٦٧).

**هەروەها إبراهيم النخعي (رحمەاللە) دەڵێ:** هاوەڵانی پێغەمبەری اللە (ﷺ) دەیان فەرموو: ئەو وتەیەی پیاو كە بە خێزانەكەی دەڵێ: (خۆشم دەوێیت) بەشێكە لە سیحر !.

وحدثنا يحيى بن معين قال حدثنا ابو نعيم قال حدثنا عيسى بن لاضحاك الكندى عن الأعمش **عن ابراهيم قال:** كانوا يقولون قول الرجل لإمرأته اني احبك طرف من السحر.[١]

جا وەك بینیت ئەمە تەنها تاكە وشەیەك بوو كە وتیان سیحرە ! مەعلومیشە كە ئەو وشەیە كوفرو شیرك نییە، كەوایە سیحر جۆری زۆرە لە بەكارهێنان بۆ شتەكان هەر وەك ئیمام شافعی بۆی پێناسە كردووین:

**ئیمامی شافعی (رحمەاللە) دەڵێ:** وشەی (السِّحْرُ) ناوێكی كۆكەرەوەیە بۆ كۆمەڵێك مانای جیاواز، جا ئەو كەسەی سیحرەكەی كردووە پێی دەوترێ باسی ئەو سیحرەمان بۆ بكە سیحری پێ دەكەیت، جا ئەگەر ئەوەی سیحری پێ كردبوو قسەیەك بوو كە كوفرێكی ڕوون و ڕاشكاو

(١) تأريخ ابن معين برواية ابن محرز.

بێت ئەوا داوای تەوبەی لێدەكرێ گەر تەوبەی نەكرد دەكوژرێت، وە ماڵەكەشی بە دەستكەوت (الفيء) دەگیرێت، وە ئەگەر ئەوەی سیحری پێ دەكرد قسەیەك بوو كە كوفر نەبوو بەڵام قسەكەی قسەیەكی نادیار و نەزانراو بوو، وە زەرەری بۆ هیچ كەس نەبوو، ئەوا نەهی لێ دەكرێت گەر دووبارەی كردەوە تەعزیر و تەمبێ دەكرێت.

**(قَالَ الإمام الشَّافِعِيُّ):** وَالسِّحْرُ اسْمٌ جَامِعٌ لَمَعَانٍ مُخْتَلِفَةٍ فَيُقَالُ لِلسَّاحِرِ صِفْ السِّحْرَ الَّذِي تَسْحَرُ بِهِ فَإِنْ كَانَ مَا يَسْحَرُ بِهِ كَلَامَ كُفْرٍ صَرِيحٍ اُسْتُتِيبَ مِنْهُ فَإِنْ تَابَ، وَإِلَّا قُتِلَ، وَأُخِذَ مَالُهُ فَيْئًا، وَإِنْ كَانَ مَا يَسْحَرُ بِهِ كَلَامًا لَا يَكُونُ كُفْرًا وَكَانَ غَيْرَ مَعْرُوفٍ، وَلَمْ يَضُرَّ بِهِ أَحَدًا نُهِيَ عَنْهُ فَإِنْ عَادَ عُزِّرَ.[١]

هەروەها سیحر كردن وەك ئیمامی شافعی باسی كرد جۆری هەیە، كەواتە سیحرێك كە كوفری تێدا نەبێت ئەوە كوفر نییە بە بەڵگەی فەرموودەكە و هەروەها تەفسیری ئیمامی شافعی بۆ وشەی سیحر و وتەكەی إبراهيم النخعي كە دامان نا، وە زانیمان وشەی (التِّوَلَةُ) پێشەوا أبو عبيد بە سیحر لێكی دایەوە، بەڵام ئایا لەو سیحرەیە كە كوفری

(١) الأم للشافعي (١/٢٩٣).

گەورەیە خاوەنەکەی لە دین دەکاتە دەرەوە یاخود کوفری بچووکەو لە دین نایخاتە دەرەوە؟!

وەڵامەکە ئەوەیە کە (التِّوَلَةُ) شتێکە ئافرەتان هەڵیانواسیوە تاکو خۆیان خۆشەویست بکەن لای پیاوەکانیان، واتە سیحرێك نەبووە کە کوفرێکی ڕوونی تێدابێت، بەڵکو وەکو سەبەبێك بەکاریان هێناوە کە ئەمە کوفری بچووکە، وە بەڵگەشمان لەسەر ئەوەی کە (التِّوَلَةُ) ئەگەر بە سیحر تەفسیر بکرێت سیحرێك نییە کە کوفری ڕوونی تێدابێت ئەوەیە کە (التِّوَلَةُ) لەگەڵ (الرقي و التمائم) باسکراوە کە ئەوانیش ڕوونە هەردووکیان کوفری بچووکن، وەك لە فەرموودەدا هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: (مَنْ عَلَّقَ تَمِيمَةً فَقَدْ أَشْرَكَ).[١]

واتە: هەر کەسێك چاوەزار یان شتێکی هاوەشێوەی هەڵبواسێت بەخۆیەوە ئەوە شیرکی کردووە.

کە ئەمەش شیرکی بچووکە، هەروەها ئەو فەرموودەیەی ئیمام ابن بطة لەم بابە هێناویەتی، کە خۆی هێنانی لەژێر ئەم بابەدا فەهمی ڕاستمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە کوفری بچووکە.

(١) مسند الإمام أحمد (١٧٤٢٢)

بەڵگەیەکی تر ئەوەیە کە لە ابن مسعود ەوە هاتووە (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ):

**يَحْيَى بْنِ الْجَزَّارِ دەڵێ:** عبدالله بن مسعود (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) چووە لای خێزانی، وە لە ملیدا شتێکی هەڵواسراو هەبوو پاشان ڕایکێشا و پچڕاندی، وە فەرمووی: ماڵ و خانەوادەی عبدالله بێ پێویستن لەوەی شەریك بۆ الله دابنێن بە شتێك کە بەڵگەی لەسەر دانەبەزیووە، پاشان فەرمووی: بیستم پێغەمبەری الله( ﷺ) دەیفەرموو: بەڕاستی نوشتە و چاوەزار و (التِّوَلَةُ) شیرکن، وتیان ئەی باوکی عبدالرحمن (ابن مسعود) ئەوە نوشتە و چاوەزار دەزانین بەڵام ئەی (التِّوَلَةُ) چییە؟!

فەرمووی: شتێکە کە ئافرەتان دروستی دەکەن کە خۆشەویستیان دەکات لای مێردەکانیان.

٤١٥١ - أخبرنا عِمْرَانُ بْنُ مُوسَى بْنِ مُجَاشِعٍ، قَالَ: حدثنا وَاصِلُ بْنُ عَبْدِ الأَعْلَى، قَالَ: حدثنا ابْنُ فُضَيْلٍ، عَنِ الْعَلَاءِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ فُضَيْلِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ يَحْيَى بْنِ الْجَزَّارِ، قَالَ: دَخَلَ عَبْدُ اللهِ عَلَى امْرَأَتِهِ وَفِي عُنُقِهَا شَيْءٌ مَعْقُودٌ، فَجَذَبَهُ فَقَطَعَهُ، ثُمَّ قَالَ: لَقَدْ أَصْبَحَ آلُ عَبْدِ اللهِ أَغْنِيَاءَ يُشْرِكُوا بِاللّٰهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَانًا، ثُمَّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلى الله عَلَيه وسَلم يَقُولُ: "إِنَّ الرُّقَى وَالتَّمَائِمَ وَالتِّوَلَةَ شِرْكٌ"، قَالُوا: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، هَذِهِ الرُّقَى وَالتَّمَائِمُ

قَدْ عَرَفْنَاهَا، فَمَا التِّوَلَةُ؟ قَالَ: شَيْءٌ تَصْنَعُهُ النِّسَاءُ يَتَحَبَّبْنَ إِلَى أَزْوَاجِهِنَّ.[٦٠٩٠][(١)]

كەواتە بۆمان دەركەوت كە (التِّوَلَةُ) شتێكە دروست كراوە و ئافرەتان هەڵیانواسیووە بەخۆیانەوە وەك چۆن چاوەزار و ئەمانە هەڵدەواسرێن، هەروەها محمد ی كوڕی عبدالوهاب لە كتاب التوحید دەڵێ: (و"التولة": شيء يصنعونه يزعمون أنه يحبب المرأة إلى زوجها، والرجل إلى امرأته).

واتە: التولة: شتێكە دروستیان دەكرد پێیان وابوو كە ژن لای مێردەكەی خۆشەویست دەكات یان پیاو لای ژنەكەی خۆشەویست دەكات.

جا هەر یەكێك لەمانە ئەو كەسەی هەڵیدەواسێت پێی وابێت ئەمانە سەبەب و هۆكارێكن بۆ ئەوەی زەرەرێك یاخود زیانێكیان پێ بگەیەنێ ئەوا شیركی بچووكە وەك باسكرا، بەڵام گەر كەسێك پێی وابێت خودی ئەم نوشتە و چاوەزارە بەڵا لادەبات و سوود دەگەیەنێت ئەوە شیركی گەورەیە، واللە تعالى اعلم].

(١) صحيح ابن حِبَّان.

**٥٤- (١١٠١)** حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ أَحْمَدَ الْكَاذِيُّ , قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَحْمَدَ, قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ نُمَيْرٍ , قَالَ: أَخْبَرَنَا الْأَعْمَشُ , عَنْ أَبِي صَالِحٍ , عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ, قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: " اثْنَتَانِ فِي النَّاسِ هُمَا بِهِمْ كُفْرٌ: الطَّعْنُ فِي النَّسَبِ , وَالنِّيَاحَةُ عَلَى الْمَيِّتِ "[١]

واتە: أَبِي هُرَيْرَة (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) دەڵێ: پێغەمبەری الله (ﷺ) فەرموویەتی: دوو شت لەناو خەڵکی هەیە هەردووکیان کوفرن: تانەدان لە ڕەچەڵەك، وە شین و ڕۆڕۆ کردن لەسەر مردوو.

**٥٥- (١١٠٢)** حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ , قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ , قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ , قَالَ سُفْيَانُ , عَنِ الْأَعْمَشِ , عَنْ أَبِي صَالِحٍ , عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ , قَالَ: ثِنْتَانِ بِالنَّاسِ هُمَا كُفْرٌ: الطَّعْنُ فِي النَّسَبِ , وَالنِّيَاحَةُ عَلَى الْمَيِّتِ.

واتە: أَبِي هُرَيْرَة (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) دەفەرمووێ: دوو شت لەناو خەڵکی هەیە هەردووکیان کوفرن: تانەدان لە ڕەچەڵەك، وە شین و ڕۆڕۆ کردن لەسەر مردوو.

(١) ئەم فەرموودەیە ئیمام أحمد لە مسند بە ژمارە (١٠٤٣٤) ، ومسلم (٦٧) لە صحیحەکەی هێناویانە.

بَابُ: (ذِكْرِ الذُّنُوبِ الَّتِي تَصِيرُ بِصَاحِبِهَا إِلَى كُفْرٍ غَيْرِ خَارِجٍ عَنِ الْمِلَّةِ) / باسكردنی ئەو تاوانانەی کە خاوەنەکەی توشی کوفرێك دەکات لە دین نایباتە دەرەوە.

**٥٦- (١١٠٣)** حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ , قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَحْمَدَ , قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: حَدَّثنَا عَبْدُ الصَّمَدِ , قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي قَالَ: حَدَّثَنَا الْحُسَيْنُ , عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ , قَالَ: حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ يَعْمَرَ , أَنَّ أَبَا الْأَسْوَدِ , حَدَّثَهُ , عَنْ أَبِي ذَرٍّ , أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: " لَيْسَ مِنْ رَجُلٍ ادَّعَى لِغَيْرِ أَبِيهِ وَهُوَ يَعْلَمُهُ إِلَّا كَفَرَ , وَمَنِ ادَّعَى مَا لَيْسَ لَهُ فَلَيْسَ مِنَّا , وَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ, وَمَنْ دَعا رَجُلًا بِالْكُفْرِ أَوْ قَالَ: عَدُوُّ اللَّهِ, وَلَيْسَ كَذَلِكَ إِلَّا حَارَ عَلَيْهِ "[١]

واتە: أَبِي ذَرّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) دەگێڕێتەوە کە بیستوویەتی پێغەمبەری اللە (ﷺ) دەیفەرموو: بۆ پیاوێك نییە خۆی بداتە پاڵ غەیری باوکی وە ئاگاداریش بێت و بزانێ کە باوکی نییە ئیللا کافر بووە، وە هەر کەسێ خۆی بداتە پاڵ ئەوەی کە هی خۆی نییە ئەوە لە من نییە، وە با جێگای خۆی لەناو ئاگری دۆزەخدا خۆش بکات، وە هەر کەسێک بانگی پیاوێك بکات بە کوفر [پێی بڵێ کافر] یان بڵێ: دوژمنی اللە، وە ئەویش بەو شێوەیە نەبێت ئیللا بۆ خۆی دەگەڕێتەوە.

(١) ئەم فەرموودەیە ئیمام أحمد لە مسند بە ژمارە (٢١٤٦٥)، ومسلم (٦١) لە صحیحەکەی هێناویانە.

**٥٧- (١١٠٤)** حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ , قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ , قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: حَدَّثَنَا يَعْلَى بْنُ عُبَيْدٍ , قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ يَعْنِي ابْنَ إِسْحَاقَ , عَنْ أَبِي جَعْفَرٍ , عَنْ عَلِيِّ بْنِ حُسَيْنٍ, قَالَ: وُجِدَ مَعَ قَائِمِ سَيْفِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَحِيفَةٌ مَقْرُونَةٌ بِهِ: بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ , أَشَدُّ النَّاسِ عَلَى اللَّهِ عَذَابًا الْقَاتِلُ غَيْرَ قَاتِلِهِ , وَالضَّارِبُ غَيْرَ ضَارِبِهِ , وَمَنْ جَحَدَ أَهْلَ نِعْمَتِهِ فَقَدْ كَفَرَ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ , وَمَنْ آوَى مُحْدِثًا فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَغَضَبُهُ , لَا يَقْبَلُ اللَّهُ مِنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ صَرْفًا وَلَا عَدْلًا "

واته: عَلِيِّ بْنِ حُسَيْنٍ دەفەرمووێ: بە دەسکی شمشێرەکەی پێغەمبەر (ﷺ) پەڕەیەك بینرا کە پێوەی هەڵواسرابوو نوسرابوو: بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، قورسترین سزای قیامەت لای الله تعالی بۆ ئەو کەسەیە کە لەجیاتی کەسی بکوژ کەسێکی تر بە ناحەق دەکوژێت، وە بۆ کەسێکە لە کەسێکی تر دەدات لە غەیری ئەو کەسەی لێیداوە، وە هەر کەسێك نکوڵی نیعمەتەکانی الله بکات ئەوا کافر بووە بەوەی الله دایبەزاندووە، وە هەر کەسێك بیدعەچییەك پەنا بدات لەعنەت و توڕەیی الله ی لەسەرە، الله تعالی لە قیامەت عیبادەتە سوننەت و فەرزەکانیشی لێوەرناگرێت.

بَابُ: (ذِكْرِ الذُّنُوبِ الَّتِي تَصِيرُ بِصَاحِبِهَا إِلَى كُفْرٍ غَيْرِ خَارِجٍ عَنِ الْمِلَّةِ) / باسكردنی ئەو تاوانانەی كە خاوەنەكەی توشی كوفرێك دەكات لە دین نایباتە دەرەوە.

٥٨- (١١٠٥) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ أَحْمَدَ , قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ , قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ , عَنْ أَيُّوبَ الطَّائِيِّ , عَنْ قَيْسِ بْنِ مُسْلِمٍ , عَنْ طَارِقِ بْنِ شِهَابٍ , عَنْ عَبْدِ اللَّهِ , قَالَ: " يَأْتِي الرَّجُلَ لَا يَمْلِكُ لَهُ وَلَا لِنَفْسِهِ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا , فَيَحْلِفُ لَهُ إِنَّكَ لَذَيْت , وَلَعَلَّهُ لَا يَحْلَى مِنْهُ بِشَيْءٍ , فَيَرْجِعُ وَمَا مَعَهُ مِنْ دِينِهِ شَيْءٌ , ثُمَّ قَرَأَ عَبْدُ اللَّهِ: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُمْ ۚ بَلِ ٱللَّهُ يُزَكِّي مَن يَشَآءُ وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٤٩﴾ ٱنظُرْ كَيْفَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ ۖ وَكَفَىٰ بِهِۦٓ إِثْمًا مُّبِينًا ﴿٥٠﴾﴾[1]

واتە: عَبْدِاللَّهِ بن مسعود (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) دەفەرمووێ: كەسێك دەچێتە لای كەسێكی تر كە توانای نییە نە بۆ ئەو نە بۆ نەفسی خۆشی كە سوودێك بگەیەنێت یان زەرەرێك بگەیەنێت، جا سوێند دەخوات دەڵێ تۆ ئەوە و ئەوەت كرد، وە لەوانەشە هیچ شتێكی بۆ نەكردبێت و سوودێكی پێ نەگەیاندبێت، جا دەگەڕێتەوە و هیچ شتێكی لە دینەكەی پێ نەماوە، پاشان عَبْدُاللَّه ئەو ئایەتانەی خوێندەوە: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُمْ ۚ بَلِ ٱللَّهُ يُزَكِّي مَن يَشَآءُ وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٤٩﴾ ٱنظُرْ كَيْفَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ ۖ وَكَفَىٰ بِهِۦٓ إِثْمًا مُّبِينًا ﴿٥٠﴾﴾ ، واتە: ئایا سەیری ئەوانەت نەكردووە كە

(١) النساء: (٤٩ – ٥٠).

خۆیان بە پاك و چاك دەزانن (وانیە) بەڵکو الله هەر کەسێکی بوێت پاکوخاوێنی دەکات و کەمترین ستەمیان لێ ناکرێت (با بە ئەندازەی ئەو دەزوە باریکەی ناوکی خورماش) بێت، سەیری بکەن چۆن درۆ دەدەنە پاڵ الله، وە بەسە ئەو درۆیە کە گوناهێکی ڕوون و ئاشکرایە.

**٥٩- (١١٠٦)** حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ أَحْمَدَ , قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ , قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ دَاوُدَ , قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ , قَالَ: أَخْبَرَنِي قَيْسُ بْنُ مُسْلِمٍ , قَالَ: سَمِعْتُ طَارِقَ بْنَ شِهَابٍ , يُحَدِّثُ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ , قَالَ: إِنَّ الرَّجُلَ لَيَخْرُجُ مِنْ بَيْتِهِ وَمَعَهُ دِينُهُ , فَيَلْقَى الرَّجُلَ لَهُ إِلَيْهِ حَاجَةٌ فَيَقُولُ: إِنَّكَ لَذَيْتَ وَذَيْتَ يُثْنِي عَلَيْهِ , وَعَسَى أَنْ لَا يَحْلَى مِنْ حَاجَتِهِ بِشَيْءٍ , فَرَجَعَ قَدْ أَسْخَطَ اللَّهَ عَلَيْهِ , وَمَا مَعَهُ مِنْ دِينِهِ شَيْءٌ .

واتە: عَبْدِاللَّهِ بن مسعود (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) دەفەرمووێ: بەڕاستی پیاو لە ماڵەکەی دەچێتە دەرەوە بە دینەکەیەوە، جا دەگات بە پیاوێك کە پێویستیەکی لەلای هەیە و پێی دەڵێ: بەڕاستی تۆ ئەوە و ئەوەت کردووە وەسف و ستایشی دەکات، وە لەوانەشە هیچ شتێك لە پێویستیەکەی بۆ جێبەجێ نەکات، پاشان دەگەڕێتەوە و الله تعالی لێی تورە بووە، وە هیچ شتێکی لە دینەکەی پێ نەماوە.

٦٠- **(١١٠٧)** حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ الْكَاذِيُّ , قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَحْمَدَ , قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ , قَالَ: سَمِعَ عَمْرُو بْنُ دِينَارٍ , عَتَّابَ بْنَ حُنَيْنٍ, يُحَدِّثُ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ , قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: " لَوْ أَمْسَكَ اللَّهُ الْقَطْرَ مِنَ السَّمَاءِ سَبْعَ سِنِينَ , ثُمَّ أَرْسَلَهُ لَأَصْبَحَتْ طَائِفَةٌ بِهِ كَافِرِينَ , يَقُولُونَ: مُطِرْنَا بِنَوْءِ الْمِجْدَحِ "[(١)]

واته: أَبِي سَعِيد (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) دەفەرمووێ: پێغەمبەری الله (ﷺ) فەرموویەتی: ئەگەر بێتوو الله حەوت ساڵ باران لە ئاسمان بگرێتەوە، پاشان بیبارێنێ كۆمەڵێك پێی كافر دەبن و دەڵێن: بارانمان بۆ باری بەهۆی ئەستێرەی میجدەح.

[الْمِجْدَحِ: یەكێك بووە لەو ئەستێرانە كە پێیان وابوو بەهۆیەوە باران دەبارێت، والله اعلم].

٦١- **(١١٠٨)** حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ , قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ , قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ دَاوُدَ , قَالَ: حَدَّثَنَا عِمْرَانُ , عَنْ قَتَادَةَ , عَنْ نَصْرِ بْنِ عَاصِمٍ التَّيْمِيِّ , عَنْ مُعَاوِيَةَ اللَّيْثِيِّ , قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

(١) ئەم فەرموودەیە ئیمام أحمد لە مسند بە ژمارە (١١٠٤٢)، وعبدالرزاق لە مصنف (٢/٢٧٤)، والحمیدي (٧٥١)، والنسائي لە سنن (١٥٢٦) هێناویانە.

«يَكُونُ النَّاسُ مُجْدِبِينَ , فَيُنَزِّلُ اللَّهُ عَلَيْهِمْ رِزْقًا مِنْ رِزْقِهِ , فَيُصْبِحُونَ مُشْرِكِينَ» , فَقِيلَ لَهُ: وَكَيْفَ ذَاكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «يَقُولُونَ مُطِرْنَا بِنَوْءِ كَذَا وَكَذَا»[١]

واته: مُعَاوِيَةَ اللَّيْثِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) دەڵێ: پێغەمبەری الله (ﷺ) فەرموویەتی: كاتی وا دێ خەڵك بێ ئاو دەبن، الله تعالى ڕزقێك لە ڕزقی خۆی بەسەریاندا دەبارێنێ [واتە: بارانێكیان بۆ دەبارێنێ]، لە پڕ دەبن بە موشریك، پێیان وت: ئەوە چۆن چۆنیە ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ)؟، فەرمووی: دەڵێن: بارانمان بۆ باری بەهۆی ئەستێرەی ئەوە و ئەوەوە.

**٦٢- (١١٠٩)** حَدَّثَنَا أَبُو شَيْبَةَ عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ جَعْفَرٍ , قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ, قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ , قَالَ: أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَمْرٍو , عَنْ أَبِي سَلَمَةَ , عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «الْمِرَاءُ فِي الْقُرْآنِ كُفْرٌ»[٢]

(١) ئەم فەرموودە ئیمام أحمد لە مسند بە ژمارە (١٥٥٣٧) هێناویەتی.
(٢) ئەم فەرموودەیە ئیمام أحمد لە مسند بە ژمارە (٧٨٤٨-١٠٥٣٩)، وأبو داود (٤٦٠٣) لە سنن هێناویانە.

بَابُ: (ذِكْرِ الذُّنُوبِ الَّتِي تَصِيرُ بِصَاحِبِهَا إِلَى كُفْرٍ غَيْرِ خَارِجٍ عَنِ الْمِلَّةِ) / باسکردنی ئەو تاوانانەی کە خاوەنەکەی توشی کوفرێك دەکات لە دین نایباتە دەرەوە.

واتە: لە أَبِي هُرَيْرَة (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: موناقەشە کردن لە قورئاندا کوفرە.

